په‌یامه‌کانی
گه‌نجان
٣١

زنجیره‌ی که‌سایه‌تییه‌کان ١



# دکتۆر موحه‌ممه‌د ئیقبال

## فه‌یله‌سوف و ئه‌دیبی شۆڕشگێڕ

موحه‌ممه‌د مه‌لا صالّح شاره‌زووری

(٣١) پەیامەکانی ڕێنوێن بۆ گەنجان

# دکتۆر موحەممەد ئیقباڵ

# فەیلەسوف و ئەدیبی شۆڕشگێڕ

## ژیانی...بەرهەمەکانی....هەندێك لە فەلسەفەکەی


نوسینی :

مامۆستا موحەمەد مەلا صالح شارەزووری

## زنجیره كتێبەكانی گۆڤاری ڕێنوێن

- ناوی كتێب: دكتۆر موحەممەد ئیقباڵ فەیلەسوف و ئەدیبی شۆڕشگێڕ
- نوسینی: مامۆستا موحەممەد مەلا صالح شارەزووری
- ناوی زنجیرە: زنجیرەی پەیامەكانی گەنجان (٣١)
- جۆری زنجیرە: زنجیرەی كەسایەتییەكان (١)
- تیراژ : ٢٠٠٠ دانە
- نۆبەی چاپ: دووەم
- ساڵی چاپ: ٢٠١٥
- ژمارەی لاپەڕە : ٦٩ لاپەڕە
- نەخشەسازی بەرگ و ناوەڕۆك : ڕێنوێن
- پێداچونەوەی: كۆچەر محمد مەلا صالح
- چاپ : چاپخانەی ڕێ نوێ
- نرخ : تەنها ٢٠٠٠ دینار
- سەرپەرشتیكار : سەركۆ كریم احمد
- ئیمەیڵ: renwen٢٠٠٩@yahoo.com
- ماڵپەڕ: www.aubyc.com

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی كتێبخانە گشتییەكان ژمارەی (١٤٢٠)ی ساڵی ٢٠١٤ ی پێدراوە


<u>**ئەم بەرهەمە تەعبیر لە بۆچونی نوسەر دەكات**</u>

# پێشکەشە

بەو مۆمانەی خۆیان ئەسووتێنن بۆ ئەوەی گەل لە تاریکی شەوەزەنگی ژیاندا نەکەون و ملیان نەشکێت.

م. شارەزووری

# پێشەكی

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

دەمێكە بە ئاواتی ئەوەم كە زانایەكی خاوەن دڵ و مێشكێكی كراوەو شارەزا بە پەنجەی كارامە پێنووسی بارخۆش بگرێتە دەست و بە درێژی لەسەر پێشەوای هەڵكەوتوو و هەستیاری (شاعر) ڕاستی و فەیلەسوفی ئیسلامی (دكتۆر موحەممەد ئیقباڵ) بە زمانی كوردی بنووسێت، بەڵام نووسینێكی درێژو تێرو تەسەل، كە هەموو ڕووەكانی ژیانی بخاتە ڕوو و هەموو هەوڵ و تێكۆشانەكانی شیبكاتەوەو پەردە لەسەر نهێنییەكانی لا بدات و بە پوختی لە بەردەمی خوێنەوارە كوردەكانی دابنێت، هەروەها بەرهەمەكانی بە ئەمینی وەربگێڕێتە سەر زمانی كوردی و خوێنەری كوردیان پێ ئاشنا بكات و ڕچەو ڕاڕەوەكەی ڕوون بكاتەوە، چونكە ژیان و خەباتی ئیقباڵ لە كاتێكی ناسكدا بووە، كاتی داگیركردن و دەستبەسەراگرتنی بەریتانیا بوو بۆ هیندستان، كە نیشتمانی ئیقباڵ بوو، ئیقباڵ دەیبینی بەریتانیا بۆ ئەوەی بە تەواوی زاڵ بێت بەسەر هینداو مەترسی ئەوەی نەمێنێ ڕۆژێك لە ڕۆژان گەلی هیند ڕاپەڕێ و لە وڵات دووری بخاتەوە، بۆ ئەمە كەوتە هەوڵدان بۆ بەربەرەكانێی ئیسلام و دوورخستنەوەی خەڵكی لە ئیسلام و بۆ نەهێشتنی حوكم و فەرمان و یاسای ئیسلام و ناشیرین كردنی ئیسلام و لێڵ كردنی

لە بەرچاوی بەچکە موسڵمانەکان بەتایبەتی لە دژی جیهاد لە ئیسلامداو فەرمانڕەوایی ئیسلام زۆر هەوڵی دەدا، تا ئەو ڕادەیە کەوتە دروستکردنی پێغەمبەرە درۆزنە وەکو (غولام ئەحمەدی قادیانی) یان برەودان بە (بابی)و (بەهائی)یەکان لە ولاتدا، بێجگە لەوەی جیاوازی ئایین و چینایەتی لە نێوان موسڵمان و بووزی و گاپەرستەکاندا هەڵدەگیرساندو ئاگرەکەی خۆش دەکرد، بۆیە کاتێ وتیان بە (مەولای موحەممەد عەلی جەناح) جیاکردنەوەی پاکستان لە هیندستان سیاسەتی (فرّق تسد)ی بەریتانیا خزمەت دەکات، فەرمووی:

نەخێر بۆ گەلی هیند بەپێچەوانەوە (وحد تسد)ە.

جا ئەم هەموو نارەواییانە بونە مەشخەڵێك و دڵ و دەروونی ئیقباڵیان ڕووناك کردەوەو هەستی هەستیاریان تێدا بزواندو کردیان بەو زاناو فەیلەسوف و بلیمەتە، کەوا ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ خەبات کردن لە ڕێی ڕزگاری موسڵمانان و گەلی هیند بەتایبەتی و مرۆڤایەتی بە گشتی، هەروەها چەندەها زانای تری وەکو (سەید ئەحمەدی سەرهەندی) و (وەلی اللە ی دەهلەوی)ی (مەولای موحەممەد عەلی جناح) و (ئەبولئەعلای مەودودی) و کۆمەڵی (نەدەوییەکان) وەکو کەژی دامەزراو لەبەردەم دەسەڵاتدارانی بەریتانیا وەستان و ژیانیان پێ تاڵ کردن، بەدەستی ژەهراوی دایان بە دەمی (غولام ئەحمەدی قادیانی) و

بە کرێگیراوەکانی تریان، بەناوی ئیسلامەوە هەموو کاتێك لە دژی دەدوان و خەڵکیان لە پیلانەکانی حاڵی دەکردو هانی مرۆڤە موسڵمانەکانیان لێ دەدا.

ئەمە هۆی حەزکردنمە لەوەی کوردەکان شارەزای ژیانی دکتۆر ئیقباڵ ببن لە لایەکەوە، لەلایەکی ترەوە بڵاوکردنەوەی ژیان و خەبات و بەرهەمی ئەو زانایە دەری دەخات کە ئاییني ئیسلام ماڵی هیچ کەس نییە و لەسەر هیچ بەرەباب و نەتەوەیەك تاپۆ نییەو کەس ناتوانێ بیکات بە ماڵی خۆی و بە دەسەنە بەشی خەڵکی لێ بدات، چەندم بەلاوە جوان بوو کە نوسەرێکی عەرەب لە نوسینێکدا بڵاوی کردبووەوە{ کە کەس ناتوانێ بڵێ موحەممەد لە نەتەوەی ئێمەیەو لە نەتەوەکانی تر نییە}، چونکە موحەممەد(ﷺ) پێغەمبەری هەموو ئادەمییەکە و بۆ هەموان وەکو یەك وایە، هەرچۆن هەتاو هەموو پارچەکانی زەوی رۆشن دەکاتەوەو نابێتە ماڵ بۆ هیچ کەرتەو بەشێکی، پێغەمبەریش وەهایەو زیادە پەیوەندی پێوەی تەنیا بە پەیڕەوی و گوێڕایەڵی کردنێتی و بەس.

ژیانی دکتۆر ئیقباڵ بە گەلێ زمان نوسراوەو بەرهەمەکانی بۆ سەر گەلێ زمان وەرگێڕاون و بونەتە چرای ڕوناك کەرەوەی گەلێ نەتەوە، بەڵام تا ئێستا نەتەوەی کورد لەم چرا ڕوناکەو لەم سەرمەشقە شیرینە بێبەش بووە کە زۆریش پێویستی پێیەتی،

زۆر لـە زانـا کوردەکانمـان ڕەنگـە هـەر ناویـشیان نەبیـستبێت، ئۆبـاڵی ئەمـەش بـە ئەسـتۆی زانـا نووسـەرەکانمانە، بـە داخ و گلەییـەوە ئـەڵێم خوێنـدەوارە کوردەکـانی ئێمـە گـەلێك لـە ژیـان و بەسـەرهاتی زانـاو فەیلەسـوف و هەسـتیارە بێگانـەکان شـارەزان، وەکـو هیگـڵ و فیۆربـاخ و داروپـن و فرۆیـدو سـارتێرو شکـسپیرو ڤۆڵتێرو تاگورو ئەهرۆو......هتد.

کەچـی زۆر کـەمیان نـەبێت لـە ژیـان و بەسـەرهاتی زانـاو فەیلەسـوف و هەسـتیارو پێـشەواو وێـژەوانانی خۆمـان شـارەزا نین و نایان ناسین، کە یەکێ لەوانە دکتـۆر (ئیقبـاڵ)ی هیندییـەو ئەبوایە زیاتر لەمانەدا شارەزابونایە، ئینجا لێرەدا دەڵێم (وەکو لـەم نامیلکەیـەی کـاك موحەممـەد شـارەزوورییەوە شـتێکت بـۆ دەردەکەوێت) دکتـۆر ئیقبـاڵ وەکـو فەیلەسـوفێکی بلیمـەت بـوو، هەسـتیارو وێـژەوانێکی قـووڵ و بەتام و مـەزەش بـوو، سـۆفیەکی ڕاسـتەقینەی خوانـاس بـوو، زانایـەکی شـارەزای ئاگـادار بـوو، نووسـەرێکی چـاپوك خامـە بـوو، پێـشەوایەکی تێگەیـشتووی دڵـسۆزی چارەسـەرکەر بـوو، بـە ڕەنگـێ کـە مانـای موسـڵمانی ڕاستەقینەی تێدا هاتبووە جێ.

بـە تـەواوی ئاگـادار بـوو لـە بـاری مرۆڤایـەتی گـشتییداو شارەزاییەکی باشی لە هـەموو بەرنامـەکانی سـەر زەویـدا هـەبوو، هـەموو بیروبـاوەڕو یاسـاو بەرنامـەکانی هەڵـسەنگاندبوو، پاشـان

وەکو فەیلەسوفێکی پسپۆڕ فەرمانی دەدا بەسەریانداو چاك و خراپی لێك جیا دەکردنەوە.

بەڵێ ناسینی (ئیقبال)ی زانا، فەیلەسوف، هەستیار، وێژەوان، پێشەوا، پزیشکی حاڵ زان، زانینی نوسین و بەرهەمەکانی چرای ڕوناك کەرەوەن بۆ هەموو مرۆڤ و نەتەوەیەك بەتایبەتی بۆ گەلی کوردی موسڵمان لەم هەنگاوە ناسکەیدا.

بۆیە کە چاوم کەوت بەم نامیلکەیەی مامۆستا موحەممەد شارەزووری گەلێك دڵشاد بووم، خۆهەرچەندە ئەمە فەریکە بەرهەمەو کاڵ و کرچی تێدا بەدی دەکەم، بەڵام بەهیوام ببێتە کلاوڕۆژنەیەك و خوێنەری کورد لێوەی سەیری دکتۆر ئیقبال بکات و دوا بە دوای ئەمە زیاترو درێژتر لە ژیان و بەرهەمی ئەو مامۆستا دڵسۆزە (دکتۆر ئیقبال) تێ بگەین.

کەواتە سوپاس بۆ کاکی (شارەزووری) و بۆ هەستی ئیسلامپەروەری و کورد دۆستی، هەزاران درودو سلاو بۆ گیانی خاوێنی دکتۆر ئیقبال.

عبدالعزیز پارەزانی ـ سلێمانی

١٩٧٤/٩/١

# پێشەکی

هەرچی ناوی (موحەممەد ئیقبالْ) بەر گوێم ئەکەوێت یەکسەر شێوەی موسڵمانێکی ڕاستم بەرچاو ئەکەوێت کە بە دەستێکی قورئانو بەدەستەکەی تری چەکی بەدەستەوە گرتبێ بۆ پاراستنی گیانی پاکی ئیسلام.

کام ئیقبالْ؟ ئەو فەیلەسوفەی کە زانایەکی بەرزی ڕووسی هەڵگەڕا بە چیای (هیمالایا) تاکو بگات بە ئیقبالْ و هەندێك لە فەلسەفەکەی وەربگرێت، ئەو مامۆستایەی کە (دایشۆ ڕۆسۆ)و (دکتۆر فیشەر)ی مامۆستا لە زانکۆی (لایپزك)و خاوەنی گۆڤاری (ئیسلامیکا) و هەستیاری ئەڵمانی و فەیلەسوف (هانس) بەوپەڕی شانازییەوە بەرهەمەکانیان گۆڕیوە بۆ ئەڵمانیو ئینگلیزیو فەڕەنسیو بەراوردیان کردووە لەگەڵ بەرهەمەکانی (گۆتە) و (نیتشە)دا، بەڵکو لە ئەڵمانیا کۆمەڵێك دامەزرێنرا بەناوی (جماعة إقبال) بۆ سەرپەرشتی گۆڕینی بەرهەمە پڕ سوودەکانی.

موحەممەد ئیقبال ئەو ئەدیبە بوو کە (ئەسکاریا) لە ئیتالیاو (مەکەنزی) لە ئەمریکاو (نیکولسون)و (براون) لە بەریتانیاو (دکتۆر عەبدولوەهاب عەزام) و (نەجیب گەیلانی) لە میسر، کونو قوژبنی ـ جاوید منزل ـ گەڕان بە شوێن کەلەپورەکەیدا، تاکو بتوانن ئیقبالْ بە گەلەکانیان بناسێنن.

منیش ناڵێم ئەتوانم ژیانی (ئیقباڵ) بنووسم "لە هەموو ڕوویەکەوە"، بەڵام ناوی ئەخەمە ناو ناوانەوە تاکو مامۆستایەکی شیاوی ئەم باسە بتوانێت بە ئەرکی سەرشانی هەڵبستێت.....

جا ئێستا فەرموون لەگەڵم بۆ لاپەڕەکانی ئەم باسە، تا بەرکوڵێك لەم خواردنە گیانییە تامەزرۆییە بکەین.

م. شارەزووری

## بەشی یەکەم: ئیقباڵ کێیە؟

خێزانی ئیقباڵ لە ڕەچەڵەکدا دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی کشمیر و لە بنەڕەتدا ـ براهمە ـ ن، کە زانایانی ئایینی ـ بوزین[1] ـ لەو ناوچەیەدا.

لە کاتی پەیدابونی دەوڵەتی (مەگۆڵی)یەکاندا یەکێك لە باپیرانی ئیقباڵ موسڵمان بووە، (موحەممەد ڕەفیقی) باپیرەی ئیقباڵ بە هۆی بێ دەرامەتی و گەڕان بە شوێن ژیاندا لە ناوچەکەی خۆیانەوە باری کرد بۆ ناوچەی (سیالکوت) لە وڵاتی (پەنجاب)[2]، لە دێی (لۆهەر) نیشتەجێ بون.

هۆی کۆچی باپیرەی بێ دەرامەتی کشمیرو گەڕانی بوو بە شوێن فەرماندا.

ئەم خێزانە تەنها باوکێكو دایکێك و کوڕێك بون، کوڕەکە ناوی (موحەممەد) بوو کە لە پاشدا خوا کردی بوو بە باوکی دکتۆر ئیقباڵ.

موحەممەد ئیقباڵ زۆر جار دانی بەوەدا ناوە کە لە پێشدا (کافر) و (براهمە) بون وەکو لەم شیعرە فارسییەدا دەڵێ:

---

[1] ئایینی بوزی ئایینێکی کۆنی هیندییەکانەو باوەڕیان بە بوونی خوا هەیە، بەڵام وا ئەزانن کە پاش مردن زیندووبوونەوە نییە.

[2] پەنجاب واتە پێنج ئاو، وڵاتێکی فراوانە لە ژووروی پاکستانو هیندستان، پاش سەربەخۆیی پاکستان دابەش کرا لە نێوان هیندستانو پاکستاندا.

مرا بنگر که در هیندستان نمی بینی

برهمن زاده آشنا برمز روم و تبریز است

واتە: سەیری من بکە، ئیتر نابینی لە هیندستاندا جگە لەم براهمەن زادە . یە زیاتر کە شارەزای نهێنییەکانی ڕۆمی و تەبریزی هەبێت، مەبەستی لە ڕۆمی (جەلالەدین)ی ڕۆمییەو لە تەبریزی (شەمس)ی تەبریزییە.

دیسان کاتێ ئەچێتە مزگەوتی (قرطبة) لە ئەندەلوسی ئیسپانیا چامەیەك ئەڵێ و لەو چامەیەشدا دان ئەنێت بەوەی کە بەراهمە زادەیەو ئەڵێ:

کافر هندی هون مین دیکه مرا ژوق و شوق

دل مین صلوه مردودلب په صلوه درود

واتە: من لە بنەچەدا کافرێکی هیندیم، بەڵام سەیری ئارەزوو و حەزم بکە، دڵم پڕە لە دروودان لە سەر پێغەمبەر ﷺ و سەر زمانیشم هەر درودە.

باوکی ئیقباڵ نموونەی باوکان بووە بۆ چاکی، جوتیارێکی زۆر لە خواترسی، رووتی، تێکۆشەر بوو لە پێناوی پێکهێنانی ژیاندا بۆ خێزانە ئاوارەکەی.

دکتۆر لە کتێبی (رموز بی خودی) دا ئەم ڕووداوەی نێوان خۆی و باوکی ئەگێڕێتەوەو ئەڵێ:

ڕۆژێك سواڵکەرێك زۆر بە توندی لە دەرگای ماڵەکەمانی ئەدا، نە جارێك، نە دوو، نە سێ، هەتا ئەهات بە توندی لێی ئەدا، منیش زۆر پەست بووم، ئەو دارەی بە دەستمەوە بوو دام بە سەریدا، ئەو شتانەی سواڵی کردبون و بەدەستییەوە بون ڕژاو پڕژا بەسەر زەویدا، چونکە گەنج بووم هەستم بە چاکەو خراپە نەئەکرد . کاتێك باوکم هات بەسەرداو ئەم دیمەنەی منو سواڵکەرەکەی دی، تێکچوو، ڕەش داگیرساو چەند دڵۆپێك فرمێسك لە چاوی کەوتە خوارەوەو فەرمووی:

دواڕۆژ، کە هەموو گەلان لە نێو هەردوو دەستی پێغەمبەر ﷺ کۆئەبنەوە بە هەموو چین و نەتەوەکانییەوە لەم کاتە ترسانەکەدا کە من لە ترسانا هەڵ ئەلەرزم هەر ئەم سواڵکەرە هەژارە دێت و دادم لەدەست ئەکات، من چۆن وەلامی پێغەمبەر ﷺ بدەمەوە ئەگەر بفەرموێت: (خوا کوڕێکی گەنجی موسڵمانی دایتێ، کەچی نەتتوانی بەپێی ئەو نەخشەی من بۆم کێشاون پەروەردەی بکەیت، بەڵکو هەر نەتوانی بیخەیتە ڕیزی ئادەمیزادەوە) جا من چۆن و چی وەلامی بدەمەوەو چی بڵێم؟

**لەدایك بونی :**

باوکی دکتۆر ئیقبالّ ماوەیەك پێش ئەوەی خوا ئیقبالّ یان پیّ ببەخشیّ لە خەویدا بینی کە کۆترێکی سپی کەوتە ژوورەکەیەوە، ئەمیش پەلاماری داو گرتی، کەچی لە ڕۆژی ٢٤ی ذي الحجة ١٢٨٩ی کۆچی بەرامبەر بە ڕۆژی ١٨٧٣/٢/٢٢ی زاینی مامۆستا ئیقبالّ لە دایك بوو و خەوەکەی باوکی هاتە دی.

**خوێندنی :**

پاش ئەوەی کە زمانی پاك بوویەوە نێررا بۆ (حوجرە) بۆی مەلا تاکو لەویّ فێری خوێندنی قورئانی پیرۆز ببێت، لە پاشان چووە قوتابخانەی (ئەسکووتی) لە سیالکوت، لەویّ خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیو ئامادەیی تەواو کرد.

لەم پلەدا ئیقبالّ دەستی دایە هۆنراوە، هەر هۆنراوەیەکی ئەهۆنیەوە ئەینارد بۆ لای مامۆستا (داغ)، کە هۆنەرێکی بەرز بوو لە زمانی (ئۆردی)[٣]دا ئەویش بۆی ڕێك ئەخستو بۆی ئەناردەوە تاکو وای لیّ هات پێویستی بە ڕێك خستن نەما.

لە دواییدا ڕۆیشت بۆ (لاهور)ی پایتەختی ولاّتی پەنجاب، کە لەو کاتەدا کانگای زانستو ئەدەب بوو، لەویّ لە زانستگای میری وەرگیراو دەستیکرد بە خوێندن بە شێوە جوانەکەی خۆی

---

[٣] ئۆردی، زمانی وتووێژی ئەو ناوچەو زمانی ڕەسمی ئێستای پاکستانە.

تاکو توانی زانستگا تەواو بکات، لە پاشان کرا بە مامۆستای فەلسەفە و زمانی ئینگلیزی لەو زانستگایەی کە خۆی لێی دەرچوو بوو.

هەر لەم ماوەیەدا توانی زانستگای ئیسلامیش تەواو بکات و بڕوانامەی خۆی وەربگرێت.

لەم کاتانەدا هیچ کۆڕێکی ئەدەبی نەئەبەسترا لە (لاهور) بەبێ ئامادەبونی مامۆستا ئیقباڵ، یان بەبێ خوێندنەوەی هۆنراوە بەرزەکانی، هەموو گۆڤارو ڕۆژنامەکان پڕ بون لە هۆنراوە ڕیشەدارەکانی.

یەکەم هۆنراوە کە خوێندییەوە لە لاهور لە ساڵی ١٨٩٩ی زاینیدا بوو، بە هۆی ئاهەنگی ساڵانەی کۆمەڵی پاراستنی ئیسلام (أنجمن حماية اسلام)، لە ژێر سەردێری ناڵەی هەتیو (ناله يتيم) بوو، لەم کاتەدا یەکەم کتێبی لە چاپ دا بەناوی ئابوری (اقتصاد)، کە بە زمانی ئۆردی بوو، سەرەڕای هۆنراوەو چامە کە بە زمانی ئینگلیزی بڵاوی ئەکردنەوە.

## چوونی بۆ ئەوروپا :

بۆ وەرگرتنی زیاتری زانست و هونەر، خولیای چوونە ئەوروپای کەوتە سەر، بۆیە لە رۆژی ۱۹۰۵/۹/۲ دا چووە دهلی، لەوێ لە لایەن زانایان و پیاوانی ئاییینیەوە پێشوازیەکی گەرمی لێ کرا، یەکێ لەو پێشوازی کەرانە (حەسەن نیزام دەهلەوی) بوو، کە لە نەوەی (نیزامەدین ئەولیا)یە، پاش چەند رۆژێك مانەوەی لە دهلی، رۆیشتە بەندەری (بۆمبای) و سواری پاپۆر بوو رۆیشت بۆ ئینگلتەراو لە زانکۆی (کمبریج) لە زانستگای فەلسەفە وەرگیرا و دەستی کرد بە خوێندن، پاش تەواو کردنی ئەم زانکۆیە رۆیشت بۆ ئەڵمانیا و بە ماوەیەکی کەم فێری زمانی ئەڵمانی بوو، لەوێش لە زانکۆی (میونیخ) وەرگیرا و توانی لەو زانکۆیەدا بڕوانامەی (دکتۆرا) لە زانستی فەلسەفەدا وەربگرێت بە پلەی زۆر باشە، لە پاشان گەڕایەوە بۆ (لەندەن) و چووە کۆلێژی یاسناسی (كلية القانون) و بڕوانامەی پارێزەری وەرگرت.

ئیقباڵ لەو ماوەیەی کە لە ئەوروپا بوو وەکو کادیرێکی ئیسلامی وابوو، دەستی کردبوو بە بڵاوکردنەوەی یاسا جوانەکانی ئیسلام و لابردنی پەردە لەسەر ئەو باوەڕە پوچانەی کە خرابونە سەر ئیسلام، بە گرتنی کۆڕی ئەدەبی و بڵاوکردنەوەی هۆنراوەکانی لە گۆڤارە بەناوبانگەکانی ئەو کاتەی ئەوروپادا.

ئیقباڵ وەکو قوتابییەکی ژیری تێگەیشتوو بۆی دەرکەوتبوو ئەو شارستانیەتەی ئەوروپا بنچینەکەی بۆشە، هیچ بریق و باقێکی ئەم شارستانییە دڵی ڕانەکێشاو نەبەزی و لەسەر بیروباوەڕەکەی خۆی و لە ئیسلام لای نەدا، بەڵکو گاڵتەی پێ ئەهات و وەکو لە دوو شیعرە هیندییەکەیدا دەرئەکەوێت:

دیار مغرب کی رهنی والو خداکی بستی دوکان نهێن هی

کهراجس تم سمجهه رهی هو وه آب زرکم عیار هوکار

تمهادی تهژیب ابنی خنجر آب هی خود کش کرێکی

جو شاخ نازك یه آشیانه بنی کا نا پایدار هوکار

واتە: ئەی دانیشتوانی ڕۆژئاوا، ئەم زەویەی خوا دوکان و چایخانە نییە، ئەوەی کەوا ئەزانن زێڕە بۆتان دەرئەکەوێت کە پووچە، ئەم شارستانییەتەی ئێوە خۆی ئەداتە بەر ئەو خەنجەرەی کە دروستی کردووە بۆ خەڵك و ئەو هێلانە قورسە بەسەر ئەو چڵە دارە ناسکەوە ناوەستێ.

پاش ماوەی تەواوبونی خوێندنی، کە سێ ساڵی خایاند، گەڕایەوە بۆ وڵات و ڕۆژی ۱۹۰۸/٦/۲۷ی زاینی گەیشتەوە لاهورو بە دەیان کەس بە هۆی گەڕانەوەی شاعیرو گەنجی تێکۆشەری ئیسلامەوە ئاهەنگی شاییان گێڕا.

## ئیقباڵی پارێزەر :

لە پێشەوە باسمان کرد کە ئیقباڵ بڕوانامەی پارێزەری وەرگرت لە (لەندەن) پاش تەواوکردنی زانستگای یاساناسی، کە گەڕایەوە بۆ نیشتمان پیشەی پارێزەری بۆ خۆی هەڵبژارد و پارێزەری بە سەربەست تر زانی لە فەرمانە میریەکانی تر، ئیقباڵ هیچ کێشەیەکی نەئەگرتە ئەستۆی تاکو نەی زانیایە خاوەنەکەی لەسەر هەقە و مافی پێشێل کراوەو هەقی داوای هەیە، ئەو کاتە بە هەموو توانایەوە هەوڵی سەندنی مافە خوراوەکەی بۆ ئەدا، بەردەوام بوو لەسەر پارێزەری تاکو ساڵی ١٩٣٤ز . واتە چوار ساڵ پێش کۆچ کردنی . جار بەجاریش لە زانکۆکاندا ئەبوو بە مامۆستاو وانەکانی فەلسەفەو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی ئەوتەوە.

زۆر لە هاوەڵەکانی (لە مامۆستایانی زانکۆکان) حەزیان ئەکرد ببیّ بە مامۆستای هەمیشەیی، بۆیە زۆر پێیان ئەوت: بۆچی نابیت بە مامۆستای هەمیشەیی لە یەکێك لەم زانکۆیانەدا.

جێگای داخە، ئەو هەموو زانستە بشارێتەوە، هەموو کاتێك لە وەڵامدا ئەیوت: {کارگوزاری ئینگلیز زۆر ستەمە، لەویش ستەمتر ئەوەیە ناتوانم ئەوەی لە دەروونمدایە بە خەڵکی رابگەیەنم، بەڵام ئێستا سەربەستم چی بڵێم ئەیڵێم، چی بکەم، ئەیکەم }.

بەڵام پەیوەندی مامۆستا ئیقباڵ لەگەڵ زانستگای ئیسلامی لە (لاهور) تەواو بەهێز بوو، هیچ کاتێك بێبەشی نەئەکردن لە ئامۆژگاری و بەرهەمەکانی.

* * * * *

ئیقبالٚ لە زانکۆ ئیسلامیەکاندا :

کاتێك کە دکتۆر (انصاری) مامۆستا ئیقباڵی بانگ کرد بۆ زانکۆی ئیسلامی لە دهلی، ئەویش لەسەر داخوازییەکەی ئەو ڕۆیشت و لەوی ئاهەنگێکی گەورەیان بۆ گێڕا، لەم ئاهەنگەدا مامۆستا ئیقباڵ وتارێکی زۆر بە نرخی مێژوویی خوێندەوە، بۆ ڕۆژی دوایی لەکۆبونەوەیەکی تردا وتارێکی کورت تری خوێندەوەو بەم نوکتەیەی خوارەوە کۆتایی بە وتارەکەی هێنا:

{ڕۆژێ هەندێ لە شاگردو بەردەستەکانی (شەیتان) چوون بۆ لای، سەیریان کرد شەیتان دانیشتووەو بەتاڵەو خەرکی جگەرەکێشانە، وتیان ئەوە چۆن وا بەتاڵ دانیشتووی؟ شەیتان وتی: هەموو کارو فەرمانی خۆمم سپاردووە بە میری بەریتانیا، من ئەمەوێت ئیتر پشوویەك بدەم}.

* * *

ئەگەر نەختێك بە وردی سەیری ئەم وتەیەی ئیقباڵ بکەین، بەتایبەتی لەو کاتەی کە هیند نێچیرێکی دەمی بەریتانیای

گورگ بووە، کەسێك بتوانێت لەو شوێنەدا و لەو ڕۆژەدا قسەی وا بکات، بۆمان دەرئەکەوێت کە چەند نەترس و لێبوردە بووە.

❊ ❊ ❊

سەرەڕای ئەوەی کە خۆی باوەڕنامەی (دکتۆرا)ی لە فەلسەفەدا وەرگرت لە زانکۆی (میونیخ)، لە لایەکی ترەوە زانکۆی (علیطرة) بڕیاریدا کە بڕوانامەی (دکتۆرا) لە ئەدەبدا بدات بە مامۆستا ئیقباڵ.

دوا بە دوای زانکۆی (علیطرة) بەماوەیەکی کەم، زانکۆی (الله آباد)یش بڕیاریدا بە بەخشینی بڕوانامەی (دکتۆر) بە مامۆستامان.

کاتێك (نادرشای ئەفغانی) بڕیاری چاك کردنی شێوەی خوێندنی دەرکرد لە وڵاتەکەی، لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا سێ کەسی هەڵبژارد بۆ دانانی ئەو ڕژێم و یاسای خوێندنەی کە (نادرشا) ئەیویست.

ئەو سێ کەسەش دکتۆر ئیقباڵ و (سێرراس مەسعودی) و (شێخ سلیمان الندوی) بون، کە ڕۆژی ۱۹۳۳/۱۰/۳۰ گەیشتنە (کابوڵ) بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزە، وەکو خۆی باسی ئەم گەشتەی بە درێژی لە کتێبی (مسافر)دا کردووە.

## ئیقباڵ و ڕامیاری :

دکتۆر ئیقباڵ تەنیا نەخشەکێشی هەموو ئەو ڕامیارانە نەبوو کە ئامانجی ڕزگاربونی موسڵمانەکانی هیند بوو، بەڵکو نەخشەکێشی ڕزگاری هەموو گەلی هیندی بوو بە تێکڕایی، لە ژێر چەپۆکی بێگانە، هۆنراوە بلێسەدارەکانی ئیقباڵ سروودی سەردەمی هەموو شۆڕشگێڕانی هیند بوو، ئەتوانین بڵێین هۆنراوە هاندەرەکانی ئەم بون بە هۆی هەڵگیرساندنی شۆڕشی هیندییەکان دژی ئینگلیزی داگیرکەر، لەگەڵ ئەوەشدا کە خۆی هاوبەشی ئەکردن بە وتەو کردەوەو سەرۆکایەتی چەند کۆمەڵێکی ڕامیاری کرد، جگە لەوەی ماوەیەکی درێژ سەرۆکی پارتی پەیوەندی موسڵمانەکان "حزب الرابطة الاسلامية" بوو.

بەسە بۆ دکتۆر ئیقباڵ سەرۆکێکی وەکو (موحەممەد عەلی نەجاح)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی پاکستان لە کاتی مردنی ئیقباڵدا بڵێت:

ئیقباڵ هاوەڵ و پێشەواو فەیلەسوفمان بوو لەناسکترین کاتدا کە بەسەر پارتەکەمان . پارتی پەیوەندی ئیسلامی . دا ئەڕۆیشت ئیقباڵ وەکو تاوێرێکی گەورە وەستاوەو هێندەی مویەك لەرەی نەکردووە.

کاتێ لە سالانی (١٩٣١. ١٩٣٢) دا کۆنگرەیەك بەسترا بە ناوی (مؤتمر الطاولة المستديرة) لە لەندەن بۆ چارەنووسی گەلی

هیند، دوکتۆر ئیقبال یەکێك بوو لە نوێنەرانی گەلی هیند بۆ ئەو کۆنگرەیە، کاتێ گەڕایەوە لە (ڕۆماو قاهیرە) لای داو چەند (محاضرة)یەکی بە زمانی ئینگلیزی لە ژێر ناوی (گۆڕانی باوەڕی ئیسلامی)دا پێشکەش کرد.

بۆ سالی دووهەم کە چووەوە بۆ کۆنگرەکەی، لە (ئیسپانیا) لای داو لە مزگەوتی (قورتوبە) نوێژی کرد، کە ئەمە یەکەم نوێژ بوو لەو مزگەوتەدا بکرێت لە پاش ئاوابونی خۆری ئیسلام لەسەر ئەو ولاتە ، لەو مزگەوتەدا چامەیەکی نووسی و لە دیوانی (بال جبرئیل) دا بلاوی کردەوە، لەژێر سەردێڕی (ئیقبال لە میحرابی قورتوبە)دا.

ئیقبال کادیرێکی ئیسلامی چابوك بوو، بۆیە قۆلی لێ هەلکێشا بوو بۆ ناوچەکانی هیندو خەلکی کۆئەکردەوەو (محاضرة)ی بۆ ئەدان.

کاتێ بۆ یەکەمجار لە سالی (١٩٣٠)دا هەلبژێرا بە سەرۆکی پارتی پەیوەندی ئیسلامی، پارتەکە ئاهەنگێکی گێڕاو لەم ئاهەنگەدا سەرۆك ئیقبال وتارێکی خوێندەوەو تیایدا پێشنیاری دامەزراندنی دەولەتێکی ئیسلامی بەناوی (پاکستان)[٤] کرد، تا

---

[٤] پاکستان، لە ١٩٤٧/٨/١٥ دا سەربەخۆیی وەرگرت واتە کۆچی ئیقبال بە نزیکەی (١٠) سال.

ئەوکاتــە نــاوی (پاکــستان) بــە مێــشکی کەسـدا نــەهاتبوو[٥]، مامۆستا ئیقباڵ دروستی کرد، بۆیە ئیقباڵ بە دامەزرێنەری دەوڵەتی (پاکستان) ئەناسرێت و لە وتارەکەیدا وتی:

ئەو گەلەی خاکێکی دیاری کراوی نەبێت کە بتوانێت چالاکی خۆی تیادا ئەنجامبدات، ئەو گەلە نە ئایینی تەواوی هەیە و نە هەرگیز ئەشبێت بە خاوەنی شارستانیەتی خۆی، چونکە ئایین بە میریی خۆیی و بە هێز پارێزگاری لیٚ ئەکرێت، هیچ چارەیەك نییە بۆ ئێمە ئەوە نەبێت کە تێبکۆشین بۆ وەدیهێنانی دەوڵەتێك بە ناوی (پاکستان) و تاکو ئێمەش ببین بە خاوەنی دەوڵەت و خاکی دیاریکراوی خۆمان[٦].

## نەخۆشی و کۆچی دوایی:

ئەو تێکۆشەرەی کەوا ئەزانرا نەخۆش ناکەوێت و مردن دڵی نایەت نینۆکە چەپەڵەکانی لە بەندی جەرگی گیر بکات، وردە وردە لاواز بوو، چەند بەردێك لە گورچیلەیدا بوو، پزیشکێك بە ناوی (حەکیم بەصیر دەهلەوی) چارەسەری کرد.

لە ساڵی (١٩٣٥)یشدا دەنگی گیرا، دیسان هەر ئەم پزیشکە چارەسەری کرد، هەر لەم ساڵەدا خێزانەکەی کۆچی دوایی کرد

---

[٥] روائع اقبال، دانراوی: أبو الحسن الندوي.

[٦] سەیری کتێبی (القائد الأعظم، محمد علی جناح) دانراوی (عەباس مەحمود عەقاد)ە بکە.

(مەولەوی ئاسایی)، بوو بە هۆی پەژارەو دڵگرانییەکی زۆر بۆ دکتۆر ئیقبال، لەم ماوەدا تووشی چەند نەخۆشییەکی جۆراوجۆر بوو، تا لە ئەنجامدا تووشی نەخۆشی دڵ بوو، کە بە تەواوی لە جموجوڵ کەوت، بەڵام هەستیاری بەرز، تا دوا هەناسەی لە وتە جوانەکانی نەکەوت، نەخۆشییەکە بە تەواوی تەنگی پێهەڵچنی بەتایبەتی لە شەوی (١٩٣٨/٤/٩) کەوتە ئەوپەڕی مەترسییەوە، لەم ڕۆژانەدا کە ئەیزانی مردن یەخەگیری بووە، وەکو هەموو موسڵمانێکی بە باوەڕ، بە زەردەخەنەوە بەرەو ڕووی مردن ئەڕۆیشت و زۆر بە پەرۆشەوە بوو بۆی.

هاوڕێیەکی ئەڵمانی هەبوو لەو کاتی نەخۆشییە قورسەیدا ئەچووە لای و پێی ئەوت ورەت چۆنە؟ مامۆستا ئیقبال پێی ئەوت من موسڵمانم مردن ناتوانێ بمترسێنێ، هەرکە مردن هات من بە شادمانییەوە پێشوازی لێ دەکەم و ئەم شیعرەی خۆی بۆ خوێندەوە:

نشانی مرد مؤمن با تو گويم

چو مرگ آمد تبسم بر لب أوست

واتە: نیشانەی پیاوی موسڵمان و بە باوەڕ بە تۆ بڵێم، ئەوەیە کە مەرگ بۆی هات زەردەخەنە لەسەر لێوی نەبڕێت.

ڕۆژی (١٩٣٨/٤/٢٠) جاویدی کوڕی بانگ کرد، کە تەمەنی سیانزە ساڵان بوو لە پێش هەندێك خزم و خوێشانی پێی وت:

ڕۆڵە لە کۆتایی ئەو کتێبەی کە دام ناوە بۆ تۆو ناوم لێ ناوە (جاوید نامە) چەند ئامۆژگارییەکی بۆ تۆو هەموو گەنجێکی موسڵمان تیایە، جا ئەگەر خوا بەزەیی پیاتا هاتەوەو مامۆستایەکی بەرچاو ڕووناکی بۆ ناردیت ئەوا زۆر باشە، خۆ ئەگەر چنگت نەکەوت ئەوە بەو ئامۆژگارییانەی من ڕەفتار بکەو ئەمە دوا وەسیەتە بۆ تۆ.

لە پێش مردنی بە (١٠) دەقیقە ئەم دوو شیعرەی وتووەو دوا چۆڕی بەرهەمە بە نرخەکانی کۆتایی پێ هێناوە:

سرود رفته باز آید که نايد نسیم أز حجاز آید که نايد

سر آمد روزگار این فقیری دکر دانای راز آید که نايد

واتە: ئایا ئیتر هەناسەو سروەی ڕۆیشتووم ئەگەڕێتەوە؟ تا شنەی شەماڵێکی حیجازم بۆ بهێنێ، کە نایشیهێنێ، بەسەرچوو ئەم ڕۆژگاری هەژارییە، تازە نهێنی زانێکی تر دێتەوە؟ کە نایەت.

ئا بەم شێوەیە لە ڕۆژی(٢١/٤/ ١٩٣٨)دا بەو شادمانییەوە گیانی شیرینی شاد کرد بە خوای خۆیو دڵە پڕ لە باوەڕەکەی بۆ دواجار لە لێدان کەوتو ماڵئاوایی لەم جیهانە بێ شەرمە کرد، لە تەمەنی (٦٧)ساڵو مانگێكو بیستو شەش ڕۆژیدا.

**بەخاك سپاردنی :**

کاتێ هەواڵی لە جیهان دەرچوونی مامۆستا ئیقبال بڵاوبوویەوە، دوکان و بازاڕو کارخانەو فەرمانگە میرییەکان داخران و مەردومەکان هەموو ڕۆیشتن بۆ ئەو خانووەی کە ناوی (جاوید منزل)ەو ماڵی مامۆستا ئیقبال بوو، سەرچاوەی ئیلهامی ئەو گۆرانیانە بوو کە هەڵگیرسێنەری ئاگری شۆڕش بون، بە هەموو برادەران و خزمەکانییەوە شوێنێکی باشیان لە تەنیشت مزگەوتەکەی خۆیەوە هەڵبژاردو لاشەی پیرۆزیان ڕا دەستی زەوی کرد.

مردنی ئیقبال گەورەترین ناسۆر بوو کە تووشی موسڵمانان بە گشتی و موسڵمانەکانی هیندی ئەو کاتە بەتایبەتی بوو.

تاگووری[7] فەیلەسوف وتی: مردنی ئیقبال لە لەشی ئەدەبی جیهانیدا برینێکی هەڵکۆڵی ساڕێژ بونی نییە، موحەممەد ئیقبال یەکێك بوو لەو مەردانەی هەوڵی بەختیاری مرۆڤایەتییان ئەدا.

[7] تاگور، فەیلەسوفێکی هیندی و یەکێك بووە لە ئەدیبانی جیهانی و خاوەنی چەند نامەیەکی (قصائد)ی زۆر بە نرخ بوو کە خەڵاتی (نۆبڵی) تێدا وەرگرت و پڕ بوون لە گیانی ئایین و نیشتمان پەروەری .

## بەشی دووەم: بەرهەمەکانی :

بەرزترین بەرهەمەکانی مامۆستا ئیقباڵ ئەو دوو کتێبە فەلسەفییەیە کە ناویان (أسرار خودي)و (رموز بی خودی)ن.

### ١.أسرار خودي:

ئەم کتێبە بە یەکێك لەو کتێبە نایابانەی ئیسلام دائەنرێت کە لە سەدەی بیستەمدا دانرابێت، بە زمانی فارسییە، ئیقباڵ هەستی ئەکرد بەوەی ڕێبازێکی تازەی هێناوەتە ناوەوە کە بتوانێت ژیان و مردنی ئادەمیزاد ببەستێت بە ئیسلامەوە، لەڕاستیشدا ئیقباڵ هەتاوێکی نوێی لەسەر جیهانی ئیسلامی هەڵ هێنا کە زۆر ڕوون بوو، ڕێگای ڕاستیان پێ دۆزییەوەو مێشکی هەزاران زانای ئەوروپی شڵەقاند.

جا بۆ ئەوەی هەستی ئیقباڵمان بۆ دەربکەوێت وا چەند شیعرێکی لە سەرەتای کتێبەکەی کە (دکتور عبدالوهاب عزام) وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی دەخەیتە پێش چاو:

انني شمس قريب المولد
حبكاً في فلك لم أعهد[8]

لم يرع ضوئي سرب الزهر

---

[8] واتە: من هەتاوێکی تازە هەڵهاتووم، بەسراوم بە گەردوونێکەوە کە نەمدیبو لە پێشدا.

لم يرجرج زئبقي في البصر[٩]

ما رأت رقص ضيائي الأبحر
ما كسا الاطواد ثوب الأحمر[١٠]

ما لهذا الكون عيني تعهد
أنا من خوف طلوعي ارعد[١١]

مزق الظلمة فجري فظهر
فبدا طل جديد في الزهر[١٢]

أنني أرقب صبحاً معلماً
حبذا من حول ناولي زمزماً[١٣]

---

[٩] واتە: هێشتا تیشکی لاریم دەمی نەدابوو لە گوڵەکان. هێشتا جیوە لە نێو چاوەکانما هاتوچۆی نەکردووە.

[١٠] واتە: هێشتا تیشکی سەماکەرم دەریای بێ بنی ژیانی نەدیبوو، کێوەکان کراسە سوورەکەمیان لەبەر نەکردبوو.

[١١] واتە: چییە وا چاوم پڕە لە پەیمان بۆ ئەم بوونەوەرە، منیش لە ترسی هەڵهاتنی خۆم ئەگرمێنم.

[١٢] واتە: ئاسۆی بەیانی هاتنم تاریکی دڕاندو گوڵەکان بە بارانێکی نمە نمەی تازە تێراو بوون.

[١٣] واتە: چاوەڕێی شەفەقێکی بەرز ئەکەم، خۆزگە لە دەوری ئاگرەکەم زەمزەمێك ببوایە مەبەستی لە ئاگرو ئاوەکەی. ئیبراهیمی خەلیلە سەلامی خوای لێ بێت.

لــە وردکردنــەوەی ژیــانی ســەرەتایی ئیقبــاڵ، وامــان بــۆ دەرئەکـەوێت کـە جەلالـەدینی ڕۆمـی زۆر کـاری کردووەتـە سـەر هەستی، پاڵ پێوەنەری بووە بۆ کۆڕی خەبات و دیسان هەر لە سەرەتای ئەم کتێبەدا ئەڵێت:

صير الرومي طيني جوهراً

من غباري شاد كوناً آخراً[١٤]

ذرة تصعد من صحرائها

لتنال الشمس في عليائها[١٥]

انني في لجة موج سري

لأصيب الدر فيه نيرا[١٦]

قال يا مجنون بين العاشقين

من حمياً العشق فأجرع كل حين[١٧]

واجعلن الضحك ينبوع البكاء

---

[١٤] واتـە: جەلالـەدینی رۆمـی قـوڕی بـوونمی کـرد بـە گەوهـەر هـەر لـەو تـۆزە کـە هەمبوونی بوونێکی تازەی دروست کرد

[١٥] لەو تۆزەی کە هەموو ئوتۆمێکی دروست کرد کە هەڵ ئەهاتەوە لە سارای بوونی خۆیداو تێ ئەکۆشا بۆ ئەوەی بگاتە هەتاو لە بڵندیدا.

[١٦] من لە گێژووی شەپۆلی دەریادا ئەرشۆم تا گەوهەرێکی نورانی بدۆزمەوە

[١٧] تـا لـەم کاتـەدا جەلالـەدین وتـی: هـەی شـێتی نێـو خـاوەن ئەوینـەکان لـە خواردنەوەی ئەوین بخۆرەوە هەموو کات.

واملأ القلب دموعاً من دما[18]

أنت نار فاضيئي للعالمين

بلهيب منك اذك الآخرين[19]

بە داخەوەی ماوەی ئەوەم نییە کە بتوانم لەسەر هەموو باسەکانی ئەم پەڕاوە پیرۆزە بنووسم، بەڵام ئەمانەی خوارەوە ناونیشانی باسە گرنگەکانی ئەم کتێبە بەنرخەیە:

١. ڕەچەڵەکی یاسای جیهانی لە خودی (ذاتیة)دا.

٢. مانەوەی بونەوەر (کون) کەوتووەتە سەر توندکردنی خودی (ذات).

٣. توندکردنی خودی بە خۆشەویستی و ئەوین ئەبێت.

٤. تەمەڵی خودی و هەست نەکردن بە لێپرسینەوە.

٥. ئەگەر خودی بە (خۆشەویستی و ئەوین)ی ڕاست توند بکرێت هەموو هێزێکی جیهانی ژێر دەستەی ئەبێت.

٦. پەروەردەی خودی بە سێ قۆناغدا ئەڕوات:

أ. مل کەچی.

ب. دەستگرتن بەسەر (نەفس)دا.

---

[18] واتە: چاوگەی پێکەنینت بکەرە کانیاوی گریان و دڵت پڕ بکە لە فرمێسکی خوێنین

[19] واتە: تۆ ئاگریت دەسا ڕێگە ڕووناك بکەرەوە بۆ جیهان، بە بڵێسەکانت خەڵکی نوستوو بێدار بکەرەوە.

ج ـ جێنشینی خوایەتی (النیابة الإلهیة).

٧. کات چەکە.

٨. ئەدەب و هۆنراوەی ئیسلامی ئەبیّ چۆن بێت؟!

٩. بەرپەرچدانەوەی ئەندێشەکانی ئەفلاتونی یۆنانی و حافزی شیرازی.

ئەم کتێبە لە ساڵی (١٩١٥)دا لە چاپ دراوەو وەرگێڕدراوەتە بۆ سەر زۆر زمان، وەکو ڕووسی و ئینگلیزی و عەرەبی...هتد.

٢. رموز بی خودی:

ئـەتوانین بڵـێین تەواوکـەری کتـێبی پێـشووی (أسـرار خـودی)یـەتی، چـونکە ئیقبـاڵ چەسـپاندی کـە بناغـەی جیهـان خۆییە لە تاکداو، تاکیش بناغەی کۆمەڵگەیە و ئەم جیهانەش لە چەند کۆمەڵگەیەك پێك هاتووەو باسی چۆنیەتی پەروەردەی ئەم خۆییـە ئـەکات، هـەروەها لـە کتێبەکەیـدا (رمـوز بـی خـودی) چارەسـەری گیروگرفتـەکانی کۆمـەڵ و دانـانی ڕژێـم بـۆ هەڵـسوکەوتیان و پـەروەردەی تـاکی تێـدا دەکـات، ئەمـەش ناونیشانی چەند باسێکیەتی:

١. سەرەتایەك، باسی پەیوەندی تاك بە کۆمەڵەوە ئەکات.

٢. کۆمەڵ چۆن لە تاك پێك دێت.

٣. کۆمەڵی ئیسلام لە دوو پایە پێك دێت:

أ. خواناسی: لەم باسەیدا ئەیسەلمێنێ کە وازهێنان‌و ترس‌و داماوی بنچینەی ناپاکین و خواناسی ئەم نەخۆشییانە ڕیشەکێش دەکات‌و بۆ هەر یەکەیان نموونە ئەهێنێتەوە.

ب. بەرنامەی پیرۆزی موحەممەد ﷺ.

نووسەر لەم باسەیدا ئەیسەلمێنێ کە چۆن سەربەستیی و یەکسانیی و برایەتی ڕاستەقینە لەم بەرنامەدا هەیەو بێ ئەم بەرنامەیە هیچ کامیان لە جیهاندا نامێنن، چەند باسێکی تری بە کەڵکی وەکو ئامۆژگاری ئافرەتانی موسڵمان.

ئەم کتێبەش بە زمانی (فارسی)یەو یەکەم جار لە ساڵی (١٩١٨) لە چاپ دراوە، پاشان چەند جاری تر لە چاپ دراوەتەوە و وەرگێڕدراوەتە سەر زمانەکانی عەرەبی و ئینگلیزی‌و ئەڵمانی.

٣. پیام مشرق:

ئەم کتێبەش بە زمانی (فارسی)یەو هۆنراوەیە، یەکەمجار لە ساڵی (١٩٣٢)دا لە چاپ دراوەو وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی لە لایەن (دکتۆر عەبدولوەهاب عەزام)ەوە، لە ساڵی (١٩٥١)دا لە (کەراچی) لە چاپ دراوەتەوە.

هۆی دانانی ئەم کتێبە ئەوەبوو کاتێ (گوتیە) هەستیاری ئەڵمانی کتێبێکی بەناوی (سلاو بۆ ڕۆژئاوا) داناو پڕوپاگەندەیەکی زۆری بۆ ڕۆژئاواییەکان کردبوو، مامۆستا ئیقبال بەم کتێبەی بەرپەرچی ئەندێشەکانی داوەتەوە، ئەم

دانراوەی بە ئایەتی (وَلِلَّـهِ الْمَشْرِقُ وَالْمَغْرِبُ) (البقـرة: ١١٥) دەست پێکراوە.

ئەمەش باسە سەرەکییەکانیەتی:

١. لقی جۆراو جۆر: چوار خشتەکی یە

٢. بیروباوەڕ: (٥١) چامەیە

٣. شەرابی نەبڕاوە: ئەمەش چەند چامەیەکی سۆزی دەروێشییە و لە شێوەی (غەزەل)[٢٠]دایە.

٤. نەخشەی فەرەنگ: ئەمەش (٢٤) پارچە هۆنراوەیە بە یادی هەستیارەکانی هاوەڵی لە ئەوروپا، ڕەخنە لە هەندێکیان دەگرێ و سەنای هەندێکیان دەکات[٢١].

٤. بانگ درا:

ئەم کتێبە بە زمانی (ئوردی)یەو لە ساڵی (١٩٢٤)دا لە چاپی داوە، ئەم بەرهەمە چەند هۆنراوەیەکی بە نرخی نیشتمانی و ئایینییە و، پێش چوونی بۆ ئەوروپا و ئەو کاتەی لە ئەوروپا بووە نووسیویەتی.

---

[٢٠] غەزەل بەو چامانە ئەوترێت کە چەند باسێکی بەشێوەی ڕەمز تێدا باس کرابێت.

[٢١] ئەم کتێبە لەنامە خانەی گشتی لە سلێمانی هەیە لە ژێر ژمارە (٨٩٢/٧) بە عەرەبی.

**٥. زبور عجم:**

ئەم بەرهەمەی بە زمانی (فارسی)یەو لە ساڵی (١٩٢٩)دا لە چاپ دراوە، ئەم کتێبەی دکتۆر ئیقباڵ بە بەرزترین بەرهەمەکانی ئەناسرێت لەرووی ئەدەبیەوە. ئەمیش چوار بەشە:

بەشی یەکەم: پاڕانەوە لە خوا.

بەشی دووەم: (٧٥) پارچە چامەیە.

بەشی سێیەم: بریتییە لەوەڵامدانەوەی (٩) پرسیاری فەلسەفی، لە ژێر ناونیشانی (گلشن راز جدید).

بەشی چوارەم: باسی خواپەرستی راستەقینە ئەکات بە ناونیشانی (کتاب العبودیة).

**٦. جاوید نامە:**

بە زمانی (فارسی)یە، ئەم دانراوەی مامۆستا ئیقباڵ زۆر گرانەو کتێبێکی فەلسەفی قووڵە، ئەو کەسەی کە زۆر شارەزایی لە فەلسەفە و مێژوو و تەسەوفدا نەبێت لێی تێ ناگات، بۆ یەکەم جار لە ساڵی (١٩٢٣)دا لە چاپ دراوە.

جاوید نامە چیرۆکێکی ئەندێشەییە، بە ئەندێشە گەردنییەکان ئەگەڕێ و گەشتیکی جیهانی گیانی (عالم الأرواح) ئەکات و چاوی بە چەند پیاوێکی ئایینی و ڕامیاریی و ئەدەبی ئەکەوێت و گفتوگۆیان لەگەڵدا ئەکات وەکو (جەمالەدینی ئەفغانی و فرعەونەکانی میسر، حەللاجی بەغداد، نیتشەی

فەیلەسوفی ئەڵمانی، بابە تایەری لوڕی هەمەدانی (عوریان)، نادرشاو چەند پیاوێکی تر). لە داوێنی ئەم کتێبەدا چەند ئامۆژگارییەکی زۆر گرنگی تێدایە بۆ هەموو لاوانی ئیسلامی لە وتەکانیدا ڕووی کردۆتە (جاوید)ی کوڕی.

۷. مسافر:

ئەم بەرهەمەی بە زمانی (فارسی)یەو لە ساڵی (١٩٣٤)دا بڵاوی کردۆتەوەو بریتییە لە چەند ئامۆژگارییەکی بە کەڵك و ئاڕاستەی نادرشای ئەفغانی و هەموو سەرۆك میرییەکانی ئیسلامی کردووە، ئەوەمان لە یاد نەچێت ئەم کتێبەی کاتێ دانا کە لەگەڵ (مەسعودی و سلیمانی الندوی)دا چون بۆ ئەفغانستان بۆ دانانی یاسای پەروەردەو زانست بۆ ئەو وڵاتە. ئەم کتێبە لە لایەن دکتۆر (حسێن دانش)ەوە کراوە بە تورکی.

۸. بال جبرئیل:

ئەم بەرهەمەی بە زمانی ئوردییەو لە ساڵی (١٩٣٥)دا بڵاوی کردۆتەوەو ئەکرێت بە چوار بەشی سەرەکییەوە:

بەشی یەکەم: (٦١) پارچە هۆنراوەیە، تێیدا باسی گیروگرفتی ئەدەب و هۆنراوەی ئیسلامی ئەکات و باسی مەرجەکانی ئەدەبی ئیسلامی ئەکات.

بەشی دووەم: چەند چامەیەكە لە كاتی چوونی بۆ قورتوبەی ئەندەلوس نوسیوویەتی بیر لە یەكەم دارخورما دەكاتەوە كە (عبدالرحمن داخل) لەوێ ناشتی.

بەشی سێهەم: لە شێوەی چیرۆكدایە بە ناونیشانی (لە پێش دەستی خودا).

بەشی چوارەم: چەند چامەیەكە بەناونیشانی (لەسەر گۆڕی ناپلیۆن).

## ٩. پس چ باید كرد أی أقوام شرق؛

ئەم كتێبە (فارسی)یەو لە ساڵی (١٩٣٦)دا بڵاوی كردووەتەوەو تیایدا ڕاستی شارستانیەتەكەی ئەوروپا باس ئەكات و چارشێو لەسەر پڕوپاگەندەی پێشكەوتنەكەیان لا دەبات، داوا لە موسڵمانەكان ئەكات كە بەو بریق و باقە نەخەڵەتێن، ئەمەی خوارەوە هەندێك لەسەر باسەكانیەتی:

١. وتووێژ لەگەڵ هەتاودا.

٢. لا اله الا الله.

٣. هەژاری.

٤. پیاوێكی سەربەست.

٥. نهێنی شەرع.

۱۰. چرب کلیم[۲۲]

ئەم کتێبە دوایین بەرهەمێتی کە خۆی لە چاپی دابێت، بە زمانی ئوردییە و لە ساڵی (۱۹۳۷)دا لە چاپی داوە، ئەم کتێبەی دیوانێکی زۆر گەورەیە و بە تەواوی شێوەی ئیسلام لەم ڕوانەی خوارەوە پیشان ئەدات:

۱. ئیسلامو پەروەردە.

۲. ئیسلامو ئافرەت.

۳. ئیسلامو ڕامیاری.

٤. ئیسلامو هونەرە جوانەکان (الفنون الجمیلة).

ئەم بەرهەمە دکتۆر (عبدالرحمن عزام) وەریگێڕاوە بۆ زمانی عەرەبی.

۱۱. أرمغان حجاز:

ئەم بەرهەمەی بە هەردوو زمانی فارسیو ئوردی داناوەو پاش کۆچی دوایی خۆی لە چاپ دراوەو ئەکرێت بە دوو بەشەوە:

بەشی یەکەم: بەزمانی فارسییەو ئەم ناونیشانانەی خوارەوەی هەڵگرتووە:

---

[۲۲] مەبەستی لە لێدانەکەی موسا پێغەمبەرە لە بەردەکە.

١ـ بۆ خوا ٢. بۆ پێغەمبەر ٣. بۆ گەل ٤. بۆ هەموو جیهانی مرڤایەتی ٥. بۆ هاوڕێکانی ئەم ڕێگایەم.

بەشی دووەم: بە زمانی ئوردییەو لە ژێر ئەم ناونیشانانەدایە:

١. کۆمەڵی ڕاوێژی (پەرلەمان) شەیتان.

٢. هاوار لە دەست....

٣. شەیتان لە هیچ ناترسێت لە ڕاپەڕینی موسڵمانەکان نەبێت، لەگەڵ چەند باسێکی تر.

**١٢. اقتصاد:**

بە زمانی ئوردییەو لە ساڵی (١٩٠١)دا لە چاپی داوە، باسی یاسا ئابورییەکانی جیهان دەکات و بەراوردی ئەکات لەگەڵ ئابوری ئیسلامدا.

**١٣. گۆڕانی میتافیزیك لە وڵاتی فارسدا:**

ئەم کتێبە (نامەی دکتۆرا)ی بوو کە لە زانکۆی (میونیخ) بڕوانامەی دکتۆرای پێ وەرگرت و لە ساڵی (١٩٠٨)دا بە زمانی ئەڵمانی بڵاوکرایەوە.

**١٤. چارەسەری باوەڕی ئایینی لە ئیسلامدا:**

ئەم کتێبەی بریتی بوو لەو (محاضرة)انەی کە لە زانکۆکاندا پێشکەشی دەکرد لە بارەی بیروباوەڕی ئیسلامییەوە،

کۆکرایەوەو ساڵی لە (١٩٣٤)دا لە چاپ دراوە، لە لایەن (عەباس مەحمود)[٢٣] ناوێکەوە وەگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی.

١٥. نامەکانی بۆ جەناح:

ئەمانە چەند نامەیەکی ئەدەبی ـ سیاسیین کاتی خۆی بۆ (موحەممەد عەلی جەناح)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی پاکستانی نووسیوەو کۆکراوەتەوەو لە ساڵی (١٩٤٤)دا لە چاپ دراوە.

١٦. وتارەکانی ئیقباڵ:

ئەو کۆمەڵە وتارە ڕامیارییانەیە کە لە کۆنگرەکانی پارتی پەیوەندی ئیسلامیدا پێشکەشی کردووە و لە ساڵی (١٩٤٤)دا لە چاپ دراوە.

١٧. نامەکانی ئیقباڵ:

وەڵامی ئیقباڵ بۆ ڕەخنەگرەکانی ئەورووپا بەشێوەی نامە بوو، جا ئەو نامانە کۆکراونەتەوەو لە ژێر ناونیشانی (نامەکانی ئیقباڵ)دا لە ساڵی (١٩٤٤)دا لە چاپ دراوە.

---

[٢٣] ئەم عەباس مەحمود (عەباس مەحمود عەقاد) نییە.

**ڕەخنە :**

کاتێ ماموٚستا (نیکلسون) کتێبی (أسرار خودی و رموز بی خودی) وەرگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزیو بڵاوی کردنەوە، هێشتا ماموٚستا ئیقباڵ خۆی لە ژیاندا بوو.

لەم کاتەدا زۆر لە زاناو فەیلەسوفەکانی جیهانی ئەو کاتە بەوپەڕی ڕێزەوە وەریانگرتو لەسەریان نووسی و ستایشیان کرد، هەندێکیشیان ڕەخنەیان لە تێڕوانینەکانی ئیقباڵ گرت . گوایە فەلسەفەکانی ئیقباڵ لەسەر بناغەی هێز (قوة) دانراوەو ئیقباڵ داوای کردووە کە هەموو گیروگرفتێك بە هۆی هێزەوە چارەسەر بکرێت، وەکو فەلسەفەکەی . نیتشەی فەیلەسوفی ئەڵمانی، ئەیانوت ئەم فەلسەفەیە بۆ هەموو مرۆڤایەتی دەست نادات، بەڵکو تەنیا بۆ موسوڵمانەکان بەکاردێت.

کاتێ ئەم ڕەخنانە ڕووی کردە (نکلسون) ئەمیش ئاگاداری ماموٚستا ئیقباڵی کرد، ماموٚستا وەڵامی هەموو ڕەخنەکانی دایەوەو بڵاوی کردەوە.

جا ئێستا بۆ نموونە وەڵامی نامەی ڕەخنەگرێکی دکتۆر ئیقباڵ ئەخەینە پێش چاو، ماموٚستایەکی ئەورووپی بەناوی (دیکسۆن) نامەیەك دەنووسێت بۆ (نکلسون)و تیایدا چەند ڕەخنەیەکی بۆ ئەنووسێت، ئەمیش ئاگاداری ماموٚستا ئیقباڵ ئەکات، ئیقباڵیش بەم شێوەیەی خوارەوە وەڵامی ئەداتەوە:

زۆر خۆشحالْم بە ڕەخنەکانی مامۆستا دیکسۆن و منیش ئەڵێم:

یەکەم: وەکو دەرئەکەوێت لە نامەکەیدا واتێگەیشتووە کە من هانی خەڵکمداوە بۆ کۆشش بۆ (هێزی ماددی)، بەلاّم من هانی خەڵکم داوە بۆ وەدیهێنانی هێزی گیانی (ڕۆحی) زیاتر لە هێزی ماددی، من وادەزانم جەنگی گەلێك لەگەڵ گەلێکی تردا بۆ سەندنی ماف و دادو ڕاستی شتێکی پێویستی سەرشانە.

وتەکەی (دیکسون) ڕاستە کە ئەڵێت: (جەنگ وڵات کاول ئەکات، ئیتر ئەو جەنگە لەسەر ڕاستی بکرێت و بۆ ڕاستکردنەوەی لاری بێت، یان بۆ سەپاندنی دەسەلاّت بێت، کەوابوو ئەبێ خۆمان لە جەنگ بپارێزین)، ئەم وتەیەی دیکسۆن ڕاستە، بەلاّم چەند جار بە چاوی خۆمان دیمان کۆنگرە گرتن و پەیمان بەستن ناتوانن شەڕ نەهێڵن بە یەکجاری، خۆ ئەگەر هەر نەهێڵرێت بە هیچ جۆرێك شەڕ بقەومێت، ئەو کاتە گەلی سەردەستەو بە دەسەلاّت، گەلە هەژارەکەی ژێردەستی ئەچەوسێنێتەوە.

دووەم: میستەر دیکسۆن ئەڵێت:

فەلسەفەکەی ئیقبالْ لە بازنەیەکی دیاریکراودا نەخشە کێشراوە، با لقەکانیشی گشتی بێت، مەبەستی ئەوەیە ئیقبالْ ڕووی فەلسەفەکەی کردووەتە گەلانی موسڵمان و بەس.

مامۆستا ئیقبالْ وەلآمی بەم جۆرە داوەتەوە:

ڕاستە، فەلسەفەو هۆنراوەو هەموو لقەکانی تری ئەدەب ئەبێ ئامانجێکی مرۆڤایەتی گشتییان هەبێت، منیش هەر بەم نیازەوە فەلسەکەم نووسیوە، بەلآم خۆ ئەبێ بگەڕێین بە شوێن یەکێکدا کە بشێت بۆ ئەوەی ئەم کالآیە بە بالآی بکات، منیش پاش گەڕانێکی زۆر بەناو گەلانی جیهاندا. بەبێ لایەنگیری کردن یان ڕەگەزپەرستی یان نیشتمانی .کەسم چنگ نەکەوت و ئاییینم چنگ نەکەوت جگە لە ئیسلامو گەلەکەی نەبێت، چونکە هەر ئیسلامە دوژمنی ڕەگەزو ڕەنگو جۆرپەرستنە، کە ئەمانەیش گەورەترین کۆسپن لە ڕێگەی بەدی هێنانی برایەتی لە نێو گەلاندا.

کاتێك سەیرم کرد لە جیهانی ئیسلامیدا خۆشەویستی نەتەوایەتیو . بەناو . نیشتمانپەرستیەکەی ئەورووپا لەناویاندا تەشەنەی کردووەو موسڵمانەکان لە ئامانجی بەرزی خۆیان لایان داوەو کەوتوونەتە ناو گێژەڵوکەی نەتەوەپەرستیو ڕەگەزپەرستی، منیش بەو شێوەیەی خۆم کە بە ئیسلام و بە دڵسۆزی ئادەمیزاد دەزانم ئەم نووسراوەم . فەلسەفەکەی . پێشکەش بە ئاشتی خوازان و دڵسۆزانی هەموو گرۆی ئادەمیزاد کرد.

بەڵی ڕاستە نەتەوەپەرستی بۆ ماوەیەکی دیاری کراو سوودی هەیە، بەڵام ئەگەر گەیشتە لوتکەی خۆی بە گەورەترین لێ قەومانی مرۆڤایەتی دوایی دێت، ڕاستە من ئیسلامم خۆش ئەوێت، بەڵام . دیکسون . بە هەڵەدا چووە کە ئەڵێت:

(خۆشەویستی ئیسلام بەرچاوی گرتووە)، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە وتراوە . کاڵا بە قەد باڵا .، کەسم دەست نەکەوت جگە لە ئیسلام کە بشێت بۆ ئەم مەبەستە پیرۆزە، دیسان ئیسلام تەسك نییە . وەکو دیکسۆن وای بۆ دەچێت . هەروەها زانستی ئیسلام نەبەستراوە بە نەتەوەیەکەوە بەبێ ئەوی تر، ئیسلام ئیسلامی عەلی کوڕی ئەبو تالیب و سەلمانی فارسی و صوهەیبی ڕۆمی و.... هتدیە، بەڵکو هەموو ئامانجێکی ئیسلام . پاش پەرستنی خوای تاك و تەنها . بڵاوکردنەوەی برایەتی و یەکسانیی و بەختیاریی ڕاستەقینەیە لە نێو هەموو ئادەمیزاددا ( قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ )[٢٤].

---

٢٤ (آل عمران: ٦٤) مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە واتە: موحەممەد بڵێ: ئەی خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان وەرنە سەر وتەیەك یەکسان بێت لە نێو ئێمە . موسڵمان . و ئێوەدا، ئەو وتەیەش ئەوەیە کە هەموومان هەر خوا بپەرستین و هاوەڵی بۆ دانەنێین و کەسمان ئەو دیکەمان بە گەورەو خاوەن فەرمان دانەنێین و

گەورەترین گومانی دیکسۆن ئەوەیە وەکو زۆربەی نەزانەکانی ئەورووپا وا ئەزانێت کە ئیسلام حەزی لە جەنگ و خوێنڕشتنە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە دەسەڵاتی خوا تەنیا بۆ موسڵمانەکان نییە، بەڵکو هەموو گەلانی سەر زەوی بەشدارن لە دەسەڵاتی خوادا، ئیسلام ئەیەوێت بتی ڕەنگ و نەتەوەو ڕەگەز بشکێنێ و نەهێڵێ کەس بتەکانی ئەورووپا پیستر لە بتەکانی چەرخی نەزانین (عصر الجاهلية) بپەرستێت.

پەیمان و کۆنگرەو فەرمانی پاشا و سەرۆك وڵات ناتوانن گەل بەختیار بکەن، بەڵکو گەل بە سەربەستی و یەکسانی و برایەتی بەختیار ئەبێت، بێ جیاوازییان بە هۆی ڕەنگ یان نەتەوە یان ڕەگەزەوە.

من لاریم لەوە نییە کە موسڵمانەکان شەڕیان کردو زۆر وڵاتیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، هەندێ لە پاشاکانی بەناو موسڵمان و بە ناوی ئایینی بێ تاوانی ئیسلامەوە هەزاران کردەوەی ناڕەوایان کرد.

بەڵام ئەبێ ئەوەش بزانین کە ئایینی ئیسلام نەهاتووە بۆ ئەوەی وڵات داگیر بکات، بەڵکو ویستوویەتی و ئەیەوێت یاساو ڕژێم بڵاو بکاتەوەو یاسایەك لەسەر بنچینەی ڕاوێژ (شورا) بێت.

---

فەرمانەکانی خوا بخەینە پشتگوێ. واتە: فەرمانی یەکتری نەخەینە سەر فەرمانەکانی خواوە.

ئیسلام نەیویستووەو ناشیەوێت کە پاشایەتی دروست بکاتو وڵات داگیر بکات، بەڵکو ئەیەوێت دادپەروەریو برایەتی و بەختیاری بڵاوبکاتەوە، بەڵام پاشاکانی بەناو ئیسلام چاویان لەم ڕاستییە نوقاندو لە ڕێڕەوی ڕاستی ئیسلام لایان داو دوورکەوتنەوە.

بەڵێ ئیسلام داوای موسڵمانبونی گەلان ئەکات، بەڵام بەبێ زۆرداریو فەلاقەو هەڵواسین، چونکە ئیسلام ئەڵێت:

( لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ ) (البقرة: ٢٥٦) واتە: زۆرەملێ نییە لە ئیسلامدا.

خۆئەگەر سەیرێکی وڵاتی (چین) بکەین بۆمان دەردەکەوێت بە دەیان ملیۆن موسڵمانی تێدایەو لە هەموو مێژووی ئیسلامدا ڕۆژێك لە ڕۆژان ئیسلام لەو وڵاتەدا هیچ دەسەڵاتێکی سەربازی یان ڕامیاری نەبووە.

بەمەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە ئیسلام ئەیەوێت دڵ لە ژەنگی خۆپەرستی پاك بکاتەوە بەبێ بەکارهێنانی هێزی ستەمکاری یان هێزی ڕامیاری.

لە ماوەی بیست ساڵەدا کە من خەریکی خوێندنەوەو نووسینی فەلسەفەی جیهانی بووم، بۆم دەرکەوتووە فەلسەفەکەی من دوورە لە هەموو لایەنگیرییەك، بەڵام ئەوروپا بێبەشە لەم گەنجینە بەنرخەی ئیسلام.

قورئانی پیرۆز کتێبێکی فەلسەفی نییە، بەڵکو چاوساغێکە بۆ پانترین شەقامی ژیان و چارەسەرکەری هەموو کێشەیەکە.

خۆ ئەگەر موسڵمانێك فەلسەفەیەکی جوانی نووسی لە ژێر تیشکی قورئاندا نابێ پێی بوترێت شەربەتێکی تازەت لە کاسە کۆنێکدا ئەداتێ، وەکو دیکسۆن ئەڵێت، بەڵکو چەند ڕاستییەکی کۆنەو بەبیرەوەری تازە ئەیدۆزیتەوەو پێشکەشی دەکەیت.

ئای، چەند بە داخەوەم بۆ نەشارەزایی ئەوروپا لە ئیسلام و فەلسەفەکەی، خۆزگە کاتم ببوایە کتێبێکی گەورەترم بنووسییایە لەسەر فەلسەفەی ئیسلام، تاکو ئەورووپاییەکان بیانزانییایە گەوجی کامەیەو فەلسەفە کامەیە؟!

ئەمە نموونەیەکی وەڵامی دکتۆر ئیقباڵ بوو، ئێمەش ئەڵێین: مشتێك نموونەی خەروارێکە.

## بەشی سێهەم: ئیقبالْ لە هەڵسەنگاندنێکدا

### ئیقبالْ و زانست :

ئەو کەسەی هەموو وتەیەکی بە ڕواڵەت جوانی دەستکەوت و گورج بێ هاڕین لە ژێر بەرداشی بیرەوەریدا قوتی بدات و هەر بیردۆزەیەکی (نظرية) بەرچاو کەوت گورج ـ ئەڵێ کوتەکی بدات بە بنا ملیا بۆی . ئەو کەسە وەکو ئەوە وایە کە هەستی تام چەشتنی[٢٥] نەما بێت، چۆن ئەگەر هەنگوین بخوات هەست بە شیرینی ناکات، هەروەها ئەگەر زەهریش بخوات هەست بە کەکرەیی و تاڵی ناکات تا ئەیکوژێت، ئەو کەسە تەنها ئەیەوێت مەشکە ڕەشی ورگی پڕ بکات و هەربژی...!

بەڵام ئیقبالْ . پەپولەی چرای زانست . باڵە کوتەی بوو بە شوێن زانستدا هەر زانستێك هەبێت و لەهەر کوێ هەبێت.

ئەم مامۆستایە بەباوەش گژوگیای زانستی کۆئەکردەوەو لە پاشان گوڵ بژاردەی ئەکرد، کامیان بە کەڵکی ژیان بهاتایە هەڵی ئەگرت و کامیان بێ سود بوایە فڕێی ئەدا، بەم جۆرە هەموو شتێکی بەنرخی لە بێ نرخ جیائەکردەوە، بەم شێوە جوانە ئیقبالْ مایەوە تاکو بوو بە خاوەنی ئەو فەلسەفە تازانەو ئەم باوەڕە قوڵانەی کە نووسەرەکان ئەیان گواستەوە لەم وڵات بۆ ئەو

---

[٢٥] حاسة الذوق .

ولاتو لەم زانكۆ بۆ ئەو زانكۆ لە ئێرانو ئەفغانستان، میسر، ئەڵمانیا، ئیتالیا، ڕوسیاو عێراق[٢٦].

بەڵێ ئەوەی كوێرانە دوای خەڵك بكەوێت ناتوانێ شتی تازە بهێنێتە كایەوە، جگە لەوەش خۆی ئەكات بە جێگای پێكەنین، بۆ نەتەوە داهاتووەكان، لە هەمان كاتیشدا خۆی (ذات)ی خۆی ئەتوێنێتەوە لە شتی بێ نرخدا.

مامۆستا ئیقباڵ هێشتا بۆنی شیری لە دەم ئەهات، كە چووە قوتابخانە بۆ خوێندنی قورئانو تێخی زمانی بە ئاوی قورئان ئاودا، بەلام ئایا ئەم قوتابییە منالە بە چ شێوەیەك قورئانی خوێند، باوكی هەموو جارێك پێی ئەوت:

كوڕم بە جۆرێك قورئان بخوێنە وەكو بۆ خۆت هاتبێتە خوارەوە، بەم جۆرە ڕووی كردە قورئانو بە شێوەیەك ئەیخوێندەوە وەكو بەتایبەتی بۆ خۆی هاتبێتە خوارەوە[٢٧].

قۆناغی سەرەتایی بەم جۆرە تەواو كردو كاتێك چووە قۆناغی ناوەندی و ئامادەییەوە مامۆستایەكی زانای وەكو (میر حەسەن) ئاوی ئەو نەمامە جوانەی ئەدا، هەركەس سەیری بكردایە بۆی دەرئەكەوت ئەو دارە پڕ میوەیەی وەكو ئیقباڵی لێ دەرئەچێت.

---

٢٦ خاوەنی كتێبی (اقبال الشاعر والفیلسوف والانسان) عێراقی و كەربەلاییە.

٢٧ ئیقباڵو باوكی ئاوەها بوون لەگەڵ قورئاندا، بەلام ئێمە قەدەغەی دەم كوتان بۆ مانای قورئانیان لێ ئەكردینو ئەیانوت: نابێ مانای بكەیت .

لە دواییدا کە چووە زانستگای میری لە لاهور وەکو لە بەشی یەکەمدا باسمان کرد، کۆمەڵی پاراستنی ئیسلام (جمعیة حمایة الاسلام) میکرۆفۆنی بۆ چۆڵ کرد تاکو بەرهەمە ئەدەبیەکانی کە پڕبون لە وشەی شۆڕشگێڕانە تیادا بڵاو بکاتەوە، هەر لەو زانستگایەدا دوو مەدالیای ئاڵتونی بە دیاری لە بلیمەتیدا پێ بەخشرا، سەرەڕای ئەوەش پاش ماوەیەکی کەم هەڵبژێررا بە سکرتێری کۆمەڵەکە.

لەو ماوەیەدا کە چوو بوو بۆ ئەورووپا و پاش ئەوەی (دکتۆرا)ی لە فەلسەفەدا وەرگرت لە (میونیخ)و گەڕایەوە بۆ (لەندەن) تا لە یاساناسیدا بڕوانامە وەربگرێت، مامۆستایەکی خۆی. کاتێ لە زانستگای میری لە لاهور مامۆستای بوو. ناوی (تۆماس ئارنۆڵد) بوو کردی بە مامۆستا لە جێگای خۆی لە زانکۆی (کامبردج) بۆ ماوەی شەش مانگ، لەو ماوەیەدا ئیقباڵ توانی لەگەڵ زۆر لە پیاوانی ڕامیاری و ئەدەب پەروەر و خاوەن بیروڕا دا هاوڕێیەتی پەیدا بکات، هەروەکو دەریای زانستی پان و بەرین بوو، ناویشی بە گەورەیی بڵاوبویەوە و زۆر لە نووسەرانی ناوچەکە ناسیان، تاکو زۆری نەخایاند نووسەرێکی بەرزی ئینگلیزی وەکو (نکلسون) خۆی چەمانەوەو بەسەر کاغەزدا تا کتێبی (أسرار خودی) مامۆستا ئیقباڵ وەربگێڕێتەوە سەر زمانی

ئینگلیزی، مامۆستا ئیقبال هەر لەو کاتەدا بە ڕۆژئاواییەکانی وت:

شارستانییەتەکەتان، هەر بەو خەنجەرەی کە دروستی کردووە خۆی پێ ئەکوژێتەوە، ئەم هێلانە بەسەر ئەم چڵەدارە لاوازەوە ناوەستێ، چونکە شارستانییەتێکی بێ بەزەیی و ماددەیەکی بێ گیانە.

مامۆستا ئیقبال سەرەڕای سوتاندنی زۆر لە مۆمی ژیان بە دیار فەلسەفەی فەیلەسوفەکانی ئیسلام وەکو: غەزالی و جەلالەدینی ڕۆمی و ئیبن روشدو... هتد زۆر شارەزاییەکی فراوانیشی بووە لە ڕۆشنبیری و فەلسەفەی ئینگلیزی و ئەڵمانی و فەرەنسی و ئەمریکیدا، چونکە مامۆستا ئیقبال سەرەڕای زمانی ئوردی و فارسی و ئینگلیزی و عەرەبی و ئەڵمانی و فەرەنسی (سەنسکریتی)یشی زانیوە.

بەسە بۆ مامۆستایەکی وەکو دکتۆر ئیقبال کاتێك بۆ یەکەم جار زانکۆی ئەفغانستان کرایەوە (وەکو لە پێشەوە باسمان کرد) پاشای ئەو ولاتە لە هەموو جیهانی ئیسلامیدا سێ کەسی هەڵبژارد بۆ دانانی یاسای خوێندن بۆ ئەو زانکۆیە کە یەکێکیان مامۆستا ئیقبال بوو.

ئیقباڵ ئەو زانایە بوو کە زاناکانی هەموو هیندو جیهانی ئیسلامی و هەموو جیهان دانیان ناوە بە بلیمەتی و زانایی و فەیلەسوفی ئەودا.

## ئیقباڵ و فەلسەفەکەی :

هەر بیروڕایەك بکەوێتە مێشکی هەر ئادەمیزادێکەوە، پاڵەپەستۆیەکی بەشوێنەوەیە، هەر فەلسەفەیەك هەڵقوڵێ لە کانی مێشکی هەر بلیمەتێکدا هۆیەکی تایبەتی هەیە، ئەگەر نەختێك سەیری ژیانی هەر داهێنەرێك یان فەیلەسوفێك یان چاکەکارێك بکەین ئەبینین هۆیەك و پاڵەپەستۆیەکی تایبەتی هەیە زۆری لێ ئەکات بۆ داهێنانی ئەو شتە تازەیەی کە ئەیهێنێت.

نموونە زۆر زۆرە لەم بارەوە پێویست بە هێنانی نموونە ناکات، جا ئێستا با بزانین ئەو پاڵەپەستۆیەی زۆری لە دکتۆر ئیقباڵ کرد، بۆ دانانی فەلسەفەکەی چی بوو؟ چی بوو بە هۆی هەڵگیرساندنی ئەم بڵێسەیە؟

کاتێك ئیقباڵ سەیری دەوروبەری خۆی کرد چی دی؟ سەیری کرد موسڵمانەکان لە شەوەزەنگی نەزانی خۆیاندا هەنگاو ئەنێن، ئیسلام کە بریتی بێت لەو تاقە ڕژێمەی گەلان بەبێ ئەو تامی بەختیاری ناچێژن، ئێستا وای لێهاتووە بووە بە سەردێڕی هۆنراوەکانی کەساسی و نەزانی و نەبونی، بیروباوەڕە

پیرۆزەکانی ئیسلام بە وتەی پڕوپووچی دوژمنەکانی چڵکن بون، پاش ئەوەی خۆیان خاوەن فەرمان بون بە ژێر چەپۆکەی ناحەزانی ئاینی ئیسلام، کاتێك ئیقباڵ ئەم ڕۆژە ڕەشەی بە موسڵمانەکانەوە دی، بۆی دەرکەوت کە پاشەڕۆژێکی ڕەشتر چاوەڕێیان دەکات.

دکتۆر ئیقباڵ جارێ بیری لەوە ئەکردەوە کە هۆی ئەم سەرلێشێواوییە بزانێت جا لە دواییدا هەوڵی دانانی چارەسەری بدات.

بەڵێ، زانی هۆکەی چییە، پاش لێکۆڵینەوەیەکی زۆر و تەتەڵەکردنی چۆنیەتی موسڵمانەکان، بۆی دەرکەوت کە گەلانی ئیسلام شەش نەخۆشییان تووش بووە بە جارێك، نەخۆشییەکان:

١. ئەم گەلانە زۆر لە کاربەدەستەکانیان ئەترسن، بەڵکو لە پلەی ترسیش دەرچووەو گەیشتووەتە پلەی پەرستن.

٢. لادانیان لە خواپەرستی ڕاستی و گەڕانەوەیان بۆ (بت پەرستییەکەی خۆیان) و دەستکردنیان بە پەرستنی زمان‌و نەتەوە و سنوری دەست کرد.

٣. کاتێك موسڵمان سەیر ئەکات بەو جۆرە لاوازبووەو برایەتی‌و یەکیەتییەکەی نەماوە ئەڵێ: بڵێم چی، ئەمە قەزاو قەدەرە، دەسەڵاتی خوام نییە، ئیتر ئەو موسڵمانە نایەوێت

هەڵسێت و خۆی بتەکێنێ وەکو شێر ڕاپەڕێت و پەلامارێك بدات، خواش یارمەتی لەسەرە.

٤. موسڵمانەکان قایلن بە ژیانی دیلی و ژێر چەپۆکەیی، هەر لەبەرئەوەی نەختێك ئازاریان تووش نەبێت.

٥. موسڵمانەکان مانای وشەی (شەهید بون) یان ون کردووە، یان لە بیریان چووەتەوە، زۆر ئەترسن لەوەی بمرن، هەر حەزیان لەم ژیانە دیلییەیە.

٦. خەڵەتاندنیان بە بریق و باقی شارستانییەتەکەی ڕۆژئاواو وەرگرتنی هەموو بیردۆزەیەك و قوت دانی بەبێ جوین.

کاتێك ئیقباڵ ئەم نەخۆشییەی دۆزییەوە، ئەمیش ئەو مامۆستاو زانا و فەیلەسوفەیە کە زۆربەی ئەوروپا گەڕاوەو قوژبنی زۆری زانکۆکانی دیوەو کۆڕی زانستی تیایاندا بەستووە، ئەم خووە لە مێشکیدا ئەسوڕایەوەو هەر بیری لەوە ئەکردەوە چۆن ڕێگایەك بدۆزێتەوەو چارەی ئەم برینانەی پێ بکات.

پاش گەڕانێکی زۆر لە جیهانی ئەندێشەی باوەڕ و فەلسەفەدا بۆی دەرکەوت کە ئەبێت لە خۆیەوە دەست پێ بکات، هەموو موسڵمانێك ئەبێ لە خۆیەوە دەست پێ بکات.

ئەمە بووە هۆی دانانی فەلسەفەکەی ئیقباڵ.

ئێستاش با بزانین کەمێك لەو فەلسەفەیەی دکتۆر ئیقبال چییەو چۆنە؟

لە ڕاستییدا فەلسەفەکەی ئیقبال فەلسەفەیەکی ئیسلامی ڕووتە و پرۆتۆپلازمی گیانی موسڵمانە.

هەندێك لە سۆفییەکان باوەڕیان هەیە بە یەکیەتی بون (وحدة الوجود) و وا ئەزانن کە تاك (فرد) ئەندێشەیەکی لە خۆبایی بونە و هیچی تێدا نییە جگە لە خۆبایی بون، وا گومان ئەکەن کە دوایی ئادەمیزادیش لکاندنە بە ئەو بونەوەرەکانی تر، وەکو دڵۆپێك ئاو بکەوێتە ناو دەریایەکی گەورەی فراوانەوە و هەر لەسەر ئەم بناغەیە فەلسەفەی نەمان لە خواپەرستییدا (الفناء في الله) دانراوە.

لە لایەکی ترەوە قوتابیانی قوتابخانەی (هیگڵ)[٢٨] زیاتر لەمانە چوونەتە خوارەوە بۆی، بەڵام ئیقبال لە نێوان هەردوولادا وەستاو دەڵێت:

نابێت، ئەمە گومانەو سەرلێشێواوییەو بناغەی سستی و لاوازی و هۆی نەخۆشییەکانی گەلەکەمانە، بەڵکو هەموو ئادەمیزادێك خاوەنی بونێکی تایبەتی و شەخسیەتێکی تایبەتی خۆی هەیە.

---

[٢٨] هیگڵ فەیلەسوفێکی ئەڵمانی بوو لە ساڵی ١٧٧٠ ز لە دایکبووەو لە ساڵی ١٨٣١ز دا مردووە.

سەیر بکە، ئەو خوایەی کە دروستکەری هەموو بونەوەرە، تاکەو جیاوازە لە هەموو دروستکراوەکانی.

ئەم بونەوەرە گەورەیە پێکهاتووە لە چەند تاکێك و هەر تاکێکی خاوەنی تایبەتمەندی خۆیەتی، ئەمانە ڕووەك، پەلەوەر، ئەوانی تر بەرد، دیسان هەر ڕووەك، ئەوە قۆخ و هەڵوژە، ئەوانە دانەوێڵە، ئەوانەش قەوزەو قامیشی شەکر،.... هتد، هەر سەیری ئادەمیزاد بکە هەندێك سپی، هەندێك ڕەش، هەندێك سوور، هەندێك زەرد، دیسان ئەمانە نەخۆش، ئەوانی تر لەش ساغ.

لەگەڵ ئەوەشدا کە هەموو مرۆڤێك خاوەنی خۆیی یان شەخسیەتێکی تایبەتییە، بەڵام لە هەندێ شتی تردا سروشتیان یەك ئەکەوێت و ئەتوانرێت یەکسانی بەسەریاندا بچەسپێنرێت.

ئێمە بەم یەکسانی و یەکێتییە هەنگاو بە هەنگاو بەرەو پێشکەوتن ئەڕۆین و هەتا بێت گرۆی ئادەمیزاد زیاتر لە یەك نزیك ئەبنەوە.

ئەم ژیانەی ئادەمیزاد هەمووی بریتییە لە یەك زنجیرەو هەر نەوەی کاتێك بریتییە لە ئەڵقەیەك لەو زنجیرە، کەوابوو بونەوەر ڕاستییەکی تەواو نەکراوە، هەر نەوەیەك کە دێت لەسەری زیاد دەکات.

من، تۆ، ئەو، یەکێکی تر، هەریەکەمان خشتێکی ئەو دیوارەی ژیانین و هەر خشتێك یارمەتی خشتەکەی تەنیشتی ئەدات بۆ

پتەوی خانووی ژیانو ئەوەی لە توانای ئەو خشتەدا هەبێت بە کاری ئەهێنێ بۆ ئەوەی دیوارەکە لە ئاستی ئەو پتەوترو قایمتر بێت.

بەم جۆرە بۆمان دەرئەکەوێت کە:

من تاکێکی جیاوازمو خاوەنی شەخسیەتێکی جیاوازم.

تۆ هەروەها خاوەنی شەخسیەتێکی خۆییەکی جیاوازی.

ئەویش، ئەوی تریش،.... هتد هەروەها.

بەلام هەریەکەمان هەوڵ ئەدەین تاوەکو خۆیی خۆمان پتەو بکەین و یارمەتی یەکتر بدەین و تێبکۆشین بۆ ئەوەی گرۆی ئادەمیزاد بەختیار بکەین و پاشەڕۆژی گەشەدار بکەین.

بەم هۆیەوە فەلسەفەی ئیقباڵ پێی وترا: (فەلسەفەی خودی= فلسفة الذات)، فەلسەفەی خۆیی.

ئیقباڵ ئەڵێ:

خۆیی، بریتییە لە خەبات و تێکۆشانی بێ وچان. بەلای ئیقباڵەوە ئەگەر ژیان خەباتو تێکۆشانی تیا نەبێ، ئەوە ژیان نییەو مردنە، ئەڵێت: (خۆیی، بەهێز ئەبێت، بە دانانی ئامانج بۆ ئەو خۆییە و تێکۆشان لە ڕێی ئەو ئامانجەدا، چونکە خاوەنەکەی تێ ئەکۆشێت و خۆی ماندوو ئەکات و ژیانی پڕ ئەبێت لە ئەوین.

بــە پێــچەوانەی ئیقباڵــەوە (شــۆ بنهــاوەر) فەیلەســوفێکی ڕۆژئـاوایی ئـەڵێت: (ژیـان بـە مـردن دوایـی دێـت، ژیـان تـەنیا بریتییە لە هەڵپەکردن، ئادەمیزاد ناتوانێ هیواکانی لە شوێنێکدا ڕابگرێت، ئادەمیزاد هەموو کاتێك برسی و تینوو تەماعکارە، هەر هەوڵی ئەوەیەتی دەست بگرێت بەسەر زیاتر لەوەی هەیەتی، خۆ ئەگــەر ئامانجــەکانی نەهاتــە دی ئــەوە جنێــو بــە ناوچـاوانی و بەختی خۆی ئەدات، ئەگەر هاتە دی ئەوە چەند ڕۆژێکی کەمەو لــە پاشــان گــۆڕ ئەیقۆزێتــەوە وەکــو هــەر نــەبووبێ و ئــەم ســەر زەوییەی نەدیبێت).

بەڵام ئیقباڵ ڕووی گرژی خۆی دەرئەبڕێت پێیان ئەڵێت:

هـاوار لـە دەستی ئێوە، چۆن هـۆش (عـەقڵ) قایل ئـەبێت بەوەی خوا بە خۆڕایی ئێمـەی دروست کردبێت، چۆن قایل ئـەبێت ئـەم هـەتاو و مـانگ و هـەموو بونـەوەرەکانی تـر، هـەر وەکـو خۆیـان بمێـنن و ئێمـەش وا بـە گـورجی بـڕزێین، بـێ لێپرسـینەوەیەك؟ نەخێر، بەڵکو هەتاو و مانگ ئەوەی لە بونەوەردا هەیـە، هـەمووی بۆ کارگوزاری ئێمە دروستکراون، (با ئێمـەش نـەزانین چیمان بۆ ئەکـەن) و هێـزی مـاددەی بـۆ دروسـتکردوین تـاکو بگـەین بـەو ئامانجـەی ئەمانـەوێت، چـۆن ئەگـەر ئـەوان بـۆ کـارگوزاری ئێمـە دروسـتکرابن و ئـەو تەمەنـە درێـژەیان هـەبێت و ئێمـەش وا زوو بمرین بە یەکجاری بێ گەڕانەوە، ئەمە ڕاست نییە.

بەڵكو شتێكی تر هەیە، پێی ئەوترێت نەمری (خلود)، بەڵێ نەمری.

ئێمە زیاترین لەوەی ئەم ماوە كەمە ببەینە سەرو بڕۆین بەبێ گەڕانەوە، ئێمە گەورەترین لەوەی كە بتوێینەوەو بچینە سەر دەریای بونەوەری بێ پایان.

مردن بریتییە لەو دیوارەی بەسەریدا باز ئەدەین بۆ ژیانێكی هەتا هەتایی ترو گۆڕ بریتییە لەو بەلەمە بچكۆلەیەی ئەمانگوێزێتەوە بۆ كەناری دەریای ژیانی نەمریو ژیانی بێ مرە مر، لەش ئەمرێ و ئەڕزێ ئەبێ بە خۆڵ و بە دەم شەماڵەوە گەرمیان و كوێستان ئەكات، بەڵام خۆیی (ذات) نازانێت مردن چییە؟

لە پاشان دكتۆر ئیقبال دەیان نموونەمان بۆ دەهێنێتەوە بۆ بونی ژیانی هەتا هەتایی و ئەڵێت:

ون بونی ئەستێرە بە ڕۆژ مانای مردن نییە، بەڵكو مژدەی هەڵهاتنی لەو ڕووناك ترە، یان ناشتنی تۆوی ڕووەك لە گۆڕی تاریكی زەویدا مانای مردن نییە، بەڵكو جوانتر خۆی ئەڕازێنێتەوە و ژیان زیاتر ئەكات، خۆ ئەگەر ئێوە ژیان بەم دوو سێ ڕۆژە ئەزانن، ئیتر هەڵپەی چیتانە و بۆ دانامركێن، بەڵام من هەوڵ ئەدەم بۆ بەهێزكردنی خۆیی خۆم، چونكە نامرم بە یەكجاری و ژیانێكی هەتا هەتایی چاوەڕێم ئەكات.

(فەلسەفەکەی ئیقباڵ فەلسەفەیەکە باڵی بە سەر هەموو گۆشەکانی ژیاندا کێشاوە، بەڵام من ماوەی ئەوەم نییە کە لە نامیلکەیەکی وا بچوکدا لەسەر هەموو فەلسەفەکەی بدوێم و باسی بکەم)، بەڵام ئەو قۆناغانەی فەلسەفەکەی ئیقباڵی پێدا دەڕوات سێ قۆناغە:

یەکەم: ئەو قۆناغەیە خۆیی (ذات)ی پێدا ئەڕوات، خۆی بە تەواوکردنی ئەم قۆناغە هەڵ ئەسێت، لەم قۆناغەدا هەر کەسە ئامانج مەبەستێك بۆ خۆی دروست ئەکات، ئەو ئامانجەش بە پێی ئەو نەخشەیە ئەکێشرێت کە قورئان ڕەنگی بۆ هەریەکەمان کێشاوە، چونکە ئیسلام ڕژێمی ژیانەوە ناوی ئایینە.

دووەم: لە پاش دانانی ئامانج و دیاریکردنی سنووری ئامانجەکەی، قۆناغی خەبات و تێکۆشان دێت، ئەویش بە یەکێتی هەموو خۆییەکان و بەکارهێنانی هێزی ماددی بۆ گەیشتن بە ئامانج، کە ئەو ئامانجەش بەختیاری گرۆی ئادەمیزادە.

بۆ تێپەڕبون بەم قۆناغەدا سێ مەرج هەیە:

١. بە گوێ کردن و بەجێ هێنانی هەموو فەرمانەکانی خوا.

٢. گرتنی نەفس و توانەوەی لە بەرژەوەندی گشتییدا.

٣. ناسینی پلەی ئادەمیزاد بە ڕاستی و دیاریکردنی قورئان لە نەخشەکانی ژیاندا.

قۆناغی سێهەم: پلەی موسڵمان، واتە دروستکردنی کۆمەڵی موسڵمانی ڕاستەقینە، ئەو موسڵمانەی خاوەنی هەموو هێزێکی ماددی و مەعنەوی بێت و نەشکرێ بە هەموو بونەوەرو سەربکەوێت بەسەر هەموو کۆسپێکدا و ترسی لە مردن نەبێت، بەڵکو بزانێت کە دیوارێکەو بازی بەسەردا ئەدات و ئەڕواتە جیهانێکی هەتا هەتاییەوە، خاوەنی دارایی و سامان بێت، بەڵام بێ لە خۆبایی بون و شەڕفرۆشتن، چونکە دەروێشی مانای سواڵکەری نییە، بەڵکو دەروێش ئەوەیە کە داراو خاوەن سامان بێت، بەڵام خاوەنی دڵێکی فراوان و بە بەزەیی (دڵی هەژار) بێت.

کاتێك کە ئەم کۆمەڵە موسڵمانە دروست بوو، ئەوسا بۆ ئەوە ئەشێ کە خوا پێیان بفەرموێت: ( كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ ) (آل عمران: ١١٠).

واتە: ئێوە باشترین نەتەوەن لەناو ئادەمیزاددا، فەرمان ئەدەن بە چاکەو خەڵکی ئەگەڕێننەوە لە خراپەو باوەڕتان بە خوا هەیە.

ئەمەیە دوا پلەی خۆیی (ذات)، ئەو خۆییە کە ئیقباڵ کردوویەتی بە بەردی بنچینەی ئادەمیزاد بە گشتی.

ئەمە نموونەیەکی زۆر کەم بوو لە فەلسەفەکەی ئیقباڵ، فەلسەفەی هێزو ژیانەوە.

ئیتر بەس نییە بۆ موسڵمان، ئایا ئەم فەلسەفەیە باشترین دەرمان نییە بۆ چارەسەرکردنی هەر شەش نەخۆشییەکەی؟!

## ئیقباڵ و ئەوینی مرۆڤایەتی :

"ئـەی تیـشکی برایـەتی و مرۆڤایـەتی، وەرە بـە هێـزە نەبەزەکـەت ڕووی ڕەشـی کینـە و قینەبەرایـەتیمان لـێ دوور بخـەرەوە، بـەڵکو جـارێکی تـر گـەلانی جیهـان ڕووی جـوانی بـەختیاری ببیـنن، ئـەو ڕووەی بـە تـەماعکاری شەڕفرۆشـان گیراوە".

ئەمە نموونەیەکە لە وتە پیرۆزەکانی مامۆستا ئیقباڵ.

ئەمە لەو وتانەی بوو کە کاتێ ئەیکردن خەوی ئەبینی بە جیهانێکەوە کە خۆشەویستی و بەختیاری باڵی بەسەردا کێشا بێت و پەرستنی نەتەوەو ڕەنگ و خوێن باوی نەمابێت و ڕژێمی چینایەتی مل شکاند بێت.

بە خۆڕایی نەبووە ئیقباڵ ئیسلامی هەڵبژاردووە بۆ ئەوەی بیکات بە شەقام و ڕێڕەوی فەلسەفەکەی و داوای لە گەلان کردووە کە بە ئیسلام چارەسەری برینەکانیان بکەن.

هەڵبژاردنی ئیسلام لە لایەن ئیقباڵەوە پاش خوێندنەوەو لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوەیەکی زۆر بووە، بۆی دەرکەوتووە ڕزگاری نییە بۆ گەلان لە چنگی ئیمپریالیزم بە ئیسلام نەبێت.

ئیقباڵ تەنها لە گیروگرفتی جیهانی ئیسلام، یان چەند دەوڵەتێك نەکۆڵیوەتەوە، بەڵکو لە هەموو کێشەکانی جیهانی کۆڵیوەتەوە، بیری لە هەموو کاربەدەستانی ئەو کاتە کردۆتەوە.

ئیقباڵ یەکەم کەس بوو بە (مۆسۆلۆنی)[٢٩] وت:"تۆ ناتوانیت تا سەر هێزی دیکتاتۆری خۆت بە سەر گەلی ئیتالیدا بسەپێنیت"، کەچی ئەوەبوو لە جەنگی جیهانی دووەمدا وتەکەی هاتەدی و کورسییەکەی سەرەو خوار بووەوە.

هەروەکو لە پێشەوە وتمان هۆنراوە شۆڕشگێڕییەکانی ئیقباڵ بوو بە هەوێنی هەڵگیرساندنی شۆڕشی ڕزگاری هیندییەکان لە چنگی ئینگلیزی خوێن مژ.

ئیقباڵ زۆر دڵگران بوو لەوەی (.....) تورکیای کرد بە بنکەی سەربازگەی ئیمپریالیزمی ڕۆژئاوایی.

ئیقباڵ خەفەتی خۆی نەشاردەوە بەرامبەر بە (ڕەزا شای پەهلەوی) شای ئێران، کە خۆی کرد بە بەندەو ئەڵقە لەگوێی ڕۆژئاواییەکان.

ئیقباڵ ئەڵێ: (ڕژێمی وڵات ئەبێ بەدەست کۆمەڵێکی زاناو تێگەیشتووەوە بێت)، هەروەها ئەڵێت: (ئەو یاسا کۆمارییەی لە ئەوروپادا هەیە، تەواو نییە، چونکە تەنیا سەیری ژمارەی زۆرو دەنگ بۆدان ئەکات، ئیتر چۆنیەتی ئەو هەڵبژێرراوانە دەخاتە پشتگوێ‌و ئەڵێت:

علة الشرق ذلة و اقتداء

---

[٢٩] مۆسۆلۆنی: لە پیاوانی ڕامیاری و دەوڵەتی بەریتانیا بوو، دامەزرێنەری (پارتی یەکێتی) دیکتاتۆری ئیتالیا بوو، کە لەساڵی ١٩٤٥ دا مرد.

ونظام الجمهور في الغرب داء

مرض القلب والبصيرة فاش

ما يشرق ولا يغرب شفاء

واتــە: نەخۆشــی گــەلانی خۆرهــەڵات دامــاوی و شــوێنکەوتنە، هــەروەها ڕژێمــە کۆمارییەکــەی ڕۆژئــاواش هــەر نەخۆشــییە، نەخۆشی دڵ و کوێری چاو بڵاوبووەتەوە، نە لە ڕۆژهەڵات و نە لە ڕۆژئاوا چاك بونی نەخۆشی نییە.

ئیقبال زۆر بە ڕەنگاری ئەو ڕامیارییە بێ ئایینیەی کە لە ئەورروپا و تورکیا و ڕوسیا بووەو هەیە کردووە، زۆر زوو مژدەی داوە بە گەلانی جیهان کە ڕامیاری بێ ئایینی ئەبێتە هۆی قەڵاچۆکردنی ئادەمیزاد.

ئا بەو جۆرە ئیقبال گیانی بوژانەوەی خستە ناو گەلانی موسڵمانەوەو چارشێوی لەسەر ڕووی هەموو ئیمپریالیزمێك هەڵدایەوە کە ئەڵێ:

"ئیمپریالیزم لەهەر شوێنێك هەواری هەڵدا، وڵات وێران ئەکات زیاتر لەوەی ئاوەدانی بکاتەوە، ئەیدزێت زیاتر لەوەی خەرجی ئەکات"، ئیقبال خۆی بەخێرخواهی هەموو گرۆی ئادەمیزاد زانیوەو داوای بەختیاری بۆ کردوون، لە هۆنراوەیەکیدا ئەڵێت:

أنا اعجمي الدن لكن خمرتي

صنع الحجاز وكرمها الفينان

ان كان لي نغم الهنود ولحنهم

لكن هذا الصوت من عدنان

واتە: ئەگەرچی زرنگەی پەرداخی شەرابەکەم عەجەمییە، بەڵام شەرابەکەم، دروستکراوی حیجازە و لە مێوە پەل درێژەکانی ئەوێ. ئەگەر ئاوازو بەستەکەم هیندی بێت، خۆ دەنگەکەم عەدنانییە (مەبەستی لە باپیرە گەورەی پێغەمبەرە ﷺ).

## ئیقبالّ نوێخوازی :

ژیان . لە فەلسەفەکەی ئیقباڵ دا . بریتییە لە چەند گۆڕانێکی نەبڕاوە، هەموو کۆمەڵێك لە ڕێ گۆڕین دایە، بۆیە پێویستی بە دانانی ڕژێمی نوێ هەیە تاکو لەگەڵ ژیانی نوێیاندا بگونجێت، بە مەرجێك ئەو نوێیەی کە دێت پەیوەندی لەگەڵ کۆنەکەدا هەبێت.

ئیقباڵ دەڵێت: دانیشتن بە دیار کۆنەوەو وەستان لە یەك پلەی ژیانداو هەر بە پیرۆز زانینی ئەو شتە کۆنەیە، وا زانین هەر ئەوە ئەوپەڕی ئامانجەو هیچی دیکەی بە دوادا نایەت، لەگەڵ ئەوەشدا کە نەگونجێت لەگەڵ ژیانی ئەو کاتەی کۆمەڵ دا، ئەوە پێی ئەوترێت وشك بون، یان کۆنەپەرستی و مراندنی هێزی مرۆڤایەتی لە پلەیەك لە پلەکانی ژیانداو بەربەستی ژیانێکی پێشکەوتووی تر بۆ ئادەمیزاد، سەرەڕای ئەوەی کە دەست

درێژییە بۆ سروشتی ئیسلام، چونکە ئایینی ئیسلام ئایینی بەربڵاویی و سەرکەوتنی هەموو پلەکانی ژیانەو ئایینی چالاکی و لێ هاتنە، بە مەرجێك ئەو شتە نوێیەی کە دێت ئیسلام نەوەستێنێت و لە چوارچێوەی ئیسلام دەرنەچێت و سودی گشتی تێدا هەبێت.

هەر لەبەر ئەمە بوو ئیقباڵ ڕووی کردە هەموو ئەو خاوەن بیرانەی لە پلەیەکی ژیاندا خۆیان ڕاگرتووە، داوایان لێ ئەکات خۆیان لەو کۆنە ڕزگار بکەن و ئیتر بەس کوێرانە دوای هەموو شتێکی کۆنی هەڵگوشراوی بێ کەڵك بکەون، لەگەڵ ئەوەشدا کە شەریعەتی ئیسلام لە هیچ کەموکوڕیی نییەو بۆ هەموو تاکێك لەم جیهانەدا لە هەر شوێنێك یان هەر نەتەوەیەك بێت ئەشێت، کەچی سەرەڕای ئەمەش ئیقباڵ حەزی کردووە کە دەرگای ئیجتیهاد بکرێتەوە بۆ ئەوەی شتی تازەی دەرهێنراو لە ژێر تیشکی قورئاندا بخرێتە ناو شەریعەتەوە[٣٠].

ئیقباڵ لەگەڵ ئەوانەشدا نییە هەر شتێکی نوێیان دەستکەوت، ئیتر کۆنەکە بە تەواوی فڕێ ئەدەن، یان لولی ئەکەن بۆ قوژبنی مۆزەخانە.

---

[٣٠] کتێبی (اقبال الشاعر والفیلسوف والانسان) دانانی: حمید مجید هدو، ل٩٩.

ئیقباڵ شۆڕشگێڕ بوو، بەڵام شۆڕشگێڕێکی ورد و بە هۆش لە شۆڕشەکەیدا، سەربەست بوو، بەڵام لەسەرخۆ لە داواکەیدا، نوێخواز بوو، بەڵام هەموو کۆنەیەکی فڕێ نەدەدا، بەڵکو بە میکرۆسکۆبی هۆش وردی ئەکردەوە، ئەوەی بە کەڵکی ئەو کاتە بهاتایە وەری دەگرت و بە بەرگی تازەوە ئەیڕازاندەوەو پێشکەشی کۆمەڵی ئەکرد.

ئیقباڵ فەیلەسوف بوو، فەیلەسوفێکی وریای لەسەرخۆ و دووربین، بە هاوەڵە نوێخوازەکانی ئەوت لەسەرخۆ بن لە وەرگرتنی هەموو شتێکی نوێدا، وەنەبێت هەموو نوێیەك ڕاستو بێ لەکە بێت، خوا چاوی پێ بەخشیون، تاکو هەموو شتێکی نوێی پێ بخەنە ژێر لێکۆڵینەوەو وردبینییەوە، وەنەبێت هەموو کۆنێکیش بە کەڵکی ژیان نەیەت.

ئیقباڵ ئەڵێت: مەرجی نوێخواز ئەوەیە، چەکدار بێت بە هۆشێکی بە باوەڕو ئەوینی مرۆڤایەتییەوە.

بەم هەڵسەنگاندنە سەرپێیە کەمێك لە چۆنیەتی دکتۆر ئیقباڵمان بۆ دەرکەوت.

* * *

من ناڵێم توانیومە ژیانی ئیقباڵ بنووسم، بەڵام بەو ڕێژەیە لە وڵاتی ئێمەداو لە کوردستانی خۆشەویستدا بەتایبەتی نەناسراوە، لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندی ئێمە لەگەڵ ئیقباڵ زیاترە

هــەتا زۆر لــە موســڵمانەکانی تــر، چــونکە ســەرمڕای ئــەوەی فەیلەسـوفێکی ئیـسلامە، کـە ئەمـەش گـەورەترین پەیوەندییـە، (ئاری) نەژادیشە.

جا بەو پێیە نەناسراوییە هیوادارم ئەم نامیلکەیەم کەڵکی لێ وەربگیرێت و چاو ببڕنە ئەو ڕێبازەی کە ئەوی پێدا ڕۆیشتووە، داواکـارم لـە خـوای بێوێنــە وێنـەی ئیقبـاڵ لـەناو گەلەکەمانـدا (گەلانی موسڵمان) زیاد بکات و ئێمەش بخاتە سەرئەو شەقامە بێ پێچ و پەنایەی کە ئیقباڵ لە ژێر تیشکی ئیسلامدا نەخشەی بۆ کێشاوین.

سا خوایە لە مامۆستا ئیقباڵ و ئێمەش خۆش ببیت.

﴿ وآخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين ﴾

سلێمانی

١٧ی/ تەموزی/١٩٧٤

## سەرچاوەکان

١. موحةممةد ئيقبالأ، ثةيام مشرق، وةرطيَرِانى د. عبدالوهاب عزام.

٢. د. عبدالوهاب عزام: محمد اقبال سيرته وفلسفته وشعره.

٣. نةجيب طةيلانى: اقبال الشاعر الثائر.

٤. أبو الحسن علي الندوي: روائع اقبال.

٥. أبو الحسن علي الندوي: ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين.

٦. حميد مجيد هدو: اقبال الشاعر والفيلسوف والانسان.

## سوپاس بۆ:

* کاك خەسرەو عەزیز خاوەنی چاپخانەی ڕاپەڕین و کارگەرانی چاپخانە ، هیوام خۆشییانە.

* کاك هیوا عومەر ئەحمەد کە یارمەتی دام لە نووسینەوەی ئەم نامیلکەیەدا.

